


ناوی کتێب: ئایسێڵ - کچە لاوێکی بێ نەوا

نووسینی: خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕانی: گۆنا غەریب

نۆبەی چاپ: پێنجەم


# ئایسێڵ

## کچە لاوێکی بێ نەوا


لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە(١٣٥١)ی ساڵی ٢٠١٠ ی پێ دراوە






ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

www.ara-m.com
ara.m@hotmail.com

0770 358 7100 - 0750 106 9589 - 0748 013 4669

بنکەی سەرەکی بلاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا - سلێمانی - شەقامی پیرەمێرد

# ئایسێل

## کچەلاوێکی بێ نەوا

نووسینی

خالید ئێرتوغرول

وەرگێڕانی

گۆنا غەریب

چاپی پێنجەم

١٤٣٤ك - ٢٠١٣ز

# پێشەکی

ئەو پەرتووکانەمان کە سەبارەت بە بابەت و کێشە زۆر زیندوو و ڕاستەقینەکانی ڕۆژگار نووسراون، خوێنەرێکی زۆریان هەیەو جێی گرنگی پێدانی خەڵکن. بەجۆرێك لە پڕفرۆشیدا ژمارەی پێوانەییان تێپەڕاندووە.

لەدوای بڵاوکردنەوەی هەریەك لەو پەرتووکانە ڕۆژانە دەیان نامەو تەلەفۆن و پەیامم پێ‌دەگات، کە تیایدا هەرکەسەو بەجۆرێك گوزارشت لە کاریگەری ڕووداو و بەسەرهاتەکانی نێو پەرتووکەکان دەکەن لەسەر ژیانیان، بەجۆرێك کە هەندێکیان بەهۆی ئەو پەرتووکانەوە کەوتوونەتە لێپرسینەوەی خودی خۆیان و لەو ڕێیەشەوە ژمارەی ئەو کەسانە لە زیادبووندایە کە بەسوود وەرگرتن لەم پەرتووکانە سڵاویان لە ژیانێکی نوێ کردووە.

بەڵێ، ئەم پەرتووکەش کە لە بەردەستتاندایە لە یەکێك لەو نامە پڕ وانە و نهێنییانەی کە بەدەستم گەیشتووە پێکهاتووە.

ئەم نامەیە لەسەر جێگای مەرگ نووسراوە، لەبەر ئەوەی نامەی نەخۆشێکە کە لە بارێکی دەروونی زۆر سەختدا و لەژێر باری ناڕەحەتی نەخۆشییەکی زۆر قورسدا و بە زەین و بیرێکی پەرش و بڵاوەوە نووسیویەتی، لەزۆر شوێندا پێویستی کردووە کە دەربڕین و ڕستەکانی ڕێکبخەین و لە شێوازی نووسینی پەرتووکی نزیك بکەینەوە.

بەڵام، هەرگیز دەستکاری ڕووداوو بابەتە سەرەکییەکانی نامەکەمان نەکردووە.

لــەم پەرتووکــەدا کەســەکانمان بــەناوی جیــاوازەوە ناســاندووە و لەهەندێك شوێندا ئەو دەربــڕین و وتانــەمان گۆڕیــوە کــە لەگــەڵ ڕەوشــت و ئاکاردا ناگونجێت.

ئــەم پەرتووکــە ژیــان و بەســەرهاتی کچــێك دەگێڕێتــەوە کــە لــە لێوارەکــانی خۆکوشــتندا بــووە، لــەم پەرتووکــەدا پەیوەندییــە کۆمەڵایەتییــەکان و کێشــەکانی ژیــانی گــەنجێتی و تێــك هەڵپڕژانــە کۆمەڵایەتییەکان دەخرێنە ژێر پرسیارەوە.

بێگومان نووسین و بڵاوکردنەوەی ئەم پەرتووکە لەپێناو ئەوەدایە کە گەنجانی تر وریاببنەوە و هەوڵ بدەن کە تووشی هەمان ئەو هەڵانە نــەبن و بەهــەمان بــارودۆخ و کێشــەی ســەختدا تێنەپــەڕن. هەربۆیــە بــە زمــانێکی سادەو ساکار نووســراوە بۆئــەوەی گــەنج و لاوی تەمەنــە جیاوازەکــان بــە ئاسانی تێبگەن...

خالید ئێرتوغروڵ

# ئەو نامەیەی گریاندمی

مانگی ڕەمەزان بوو، بێدەنگییەکی سامناك باڵی بەسەر ژوورەکەمدا کێشا بوو، چەند کاتژمێرێك بوو لەسەر مێزەکەم فرمێسکم دەرشت. نامەیەکی درێژ لەبەردەممدا، بەردەوام لەگەڵ هەر وشەیەکیدا ناخم دەسوتا و جەرگم پارچە پارچە دەبوو، ئەم حەقیقەتە کاریگەرە هەموو ژیانمی هەژاندبوو...

هەموو ڕۆژێك لە خوێنەری کتێبەکانمەوە چەندەها نامەم پێدەگەیشت. هەر نامەیەك خەمێکی جیا، کێشەیەکی جیا، یاخود خۆشییەکی جیاوازی لەئامێز گرتبوو، لە هەندێکیانەوە سەدای هاوار و یارمەتی و لە هەندێکیشیانەوە مژدەی شادی و لە هەندێکی تریشیاندا تکای ڕێگە چارەی کۆمەڵێ گرفتی ڕۆژانە دەکرا، زۆرجار نامەکان بە نزاو سەلام کۆتاییان دەهات، بەڵام ئەم نامەیە جیاوازە لەوان، هەر پیتێکی بەدەم فرمێسك و ئازارەوە نووسرابوو، ئەوەندە پەند ئامێزو، سەرسورهێنەر و پڕ لە مەینەتی بوو کە نازانم چۆن مرۆڤێك بەرگەی ئەم هەموو ئازار و نارەحەتییە دەگرێت؟! وادەبینرا کە سەدان قەساب هێرشیان کردبێتە سەر خاوەنی ئەم نامەیە و بە چەقۆ خوێناوییەکانی دەستیانەوە ئەم بێتاوانەیان ئەنجن ئەنجن کردبێت. هەر کە لەخوێندنەوەی نامەکە تەواو بووم وەکو منداڵێك دەستم کرد بە گریان...

هاوسەرەکەم کە دەنگی گریانەکەمی بیستبوو، هاتە ژوورەکەمەوە، هەر کە نامەکانی سەر مێزەکەی بینی، پرسی: دیسانەوە ئەمانە؟

وتم: بەڵێ، بەڵام ئەم جارەیان زۆر جیاوازە...

خێزانیشم ڕاهاتبوو بە دۆخەکە، ئەو نامانەی کە دەهاتن دەیانکردینە هاوپشکی خۆشی و ناخۆشییەکانیان. ئەگەر نامەکان پڕ دەرد و ئازار بوونایە، چاوەکانمان دەبوونە وەرگێڕیان و ئەسرینەکان دڵیان دەدایەوەو، ئەگەر مژدە بەخش بوونایە پێکەوە دڵخۆش و شادومان دەبووین.

لە نامەکەدا دەڵێت: بەهۆی هەڵبژاردنی هەڵەمەوە لە ژیاندا هەموو هەلێکم لەدەست چوو. تەنها چارەم چاوەڕێی ساتێك زووتر کۆتایی هاتنی ژیانمە. لەم دونیایەدا خۆم وەك گوناهکارێك دەبینم کە هەموو ژیانی خۆی لەناوبردبێت، بەو پێیەی شتێك نەماوە کە بەسەرم نەیەت و نەیبینم، دەپاڕێمەوە مەرگ ئیدی وەرە و زوو دەربازم بکە. چەندین مانگە چاوەڕوانی ئەو کۆتاییە ئەفسوناوییەم تا بێت و ڕزگارم بکات. !

خاوەنی نامەکە کە هەر لە زووەوە هەستی بەندەیی و مەبەستی بوونی لەیاد کردبوو، بەم چەند دێرە نامەکەی دەست پێکردبوو، بەڵام نامەکەی بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر کۆتایی دەهات، کۆتاییەك کە ژیانمانی خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە، بەجۆرێك لەتاو کاریگەرییەکەی نەدەهاتینەوە سەر خۆمان...

جارێکی تر دەستم کردەوە بە خوێندنەوەی ئەو نامەیەی کە ژیانی لە مەینەتی و نارەحەتی چنراوی کچێکی گەنجی کردبووە باس و سەر دێڕی.

## دەستپێکی پڕ ناسۆری نامەکە:

بەڕێز مامۆستا خالید، بمبوورە کە بە شێوازێکی زۆر هەڵاوێر نامەکەم نووسیوە.

دەبێ ئەوە بزانن کە ئەم دێرانە لەسەر جێگای مەرگ ڕەش دەکەمەوە، مامۆستا خۆت دەزانی کاتێک کەسێک لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا بێت چەندە لە ئازار و ناجێگیریدا دەژی، هەربۆیە وشە و دەربڕینەکانم خوارن و، ناشتوانن ئەوەی لە ناخمدایە وەکو پێویست بیگەیەنن. جگە لەوەی ئەم نامەیەم بۆ ئەوە نەنووسیوە تا ببێتە شاکارێکی ئەدەبی، تەنها مەبەستم لە نووسینی ئەوەیە ببێتە هۆکارێک تا مرۆڤەکان بەخۆیاندا بچنەوە و کاتێك کەسانێکی بێ ناز و ستەم دیدە دەبینن لە بەرامبەریان خۆیان بە بەرپرس بزانن و مامەڵەیان لەتەکدا بکەن...

من زۆرم چەشت.. بەداخەوە گەیشتمە دواهەمین وێستگە، هەموو پاکیزەیی و دروستییەکم، هەموو هەست و سۆزو بیری بێگەردو پاکم لە ناوچوو، چیتر لە خۆم و لە هەر شتێك کە لێوەی نزیك دەبمەوە شەرم دام دەگرێ، ئیدی نامەوێ کەسێکی تر وەك ئەم ژیانەی من بژی و ئەوەی بەسەربێت کەبەسەر مندا هات. هەربۆیە لەپێناوی ئەوەی دەنگم بگاتە هەمووان و هیچ کەسێك چەوتییەکانی من دووبارە نەکاتەوە، دەستی لەرزۆکم خامەی شەکەتی گرتە ئامێز.

با ئەوە بڵێم بۆچی ئەم نامەیە بۆ ئێوەیەو بۆ کەسێکی تری نانووسم. خۆ ئەگەر بتوانم وشەکانم لەتەنیشت یەك ڕیز بکەم و چەند ڕستەیەك دروست بکەم، بۆچوونی خۆمتان بۆ ڕوون بکەمەوە..

لەسەر ئەو جێگای مەرگەی کە لێی ڕاکشابووم، هەفتەی ڕابردوو دوا هەوڵی خۆمدا، بۆ دواجار چوومە دەرەوە و لەگەڵ ئەو مرۆڤە

خیانەتکارانەدا ڕوویەڕوو بوومەوە. گەر ئەوانیش گوێبیستی من نەبن بەڵام من هیچ نەبێ قین و خەشم و توڕەیی خۆمیان ئاراستە دەکەم تا هیچ نەبێ کەمێك پشوو بە ویژدان و ناخم بدەم. چونکە ئەوان هەموو شتێکی منیان برد، کردمیانە پەندی زەمانە، هەر هیچ نەبێ ئەمە تۆڵەیەکی بچووك و دڵ دەرەوەیەك بوو بۆ من.

بەم حاڵەمەوە لە نەخۆشخانە چوومە دەر، بەڵام بەم جەستە لاواز و تەواوبووەوە کە کۆتا ڕۆژەکانی دەژمێرێت، بۆ کوێ؟ توانیم تەنها چەند هەنگاوێك بنێم.

ڕۆیشتن؟ بۆ کوێ؟... ئەو ڕۆژانە بەسەرچوون... تەنها توانیم بچمە بەردەم نەخۆشخانەکە. سەیری لای ڕاست و چەپی خۆمم کرد نەفرەت و خەشمی خۆم بەوانە ڕشت کە لەڕوویاندا هیچ هەستێکی مرۆڤایەتی بەدی نەدەکرا. دواتر لەلای بڵاوکراوە فرۆشێکدا وەستام.

بەدەنگێکی زۆر نزم و لەسەرخۆ کە خۆم بە ئەستەم گوێم لێ بوو! ئەی خەڵکینە وریای خۆتان بن، بەم مرۆڤانە هەڵمەخەڵەتێن، چیتان هەبێت دەیبەن، هیچ باکیان لێی نیە و بە ناڕەوای نازانن، بەتایبەتی ئەوەی پێی دەوترێت (شەرەف)، (ناموس)، (کەسێتی) یان (ڕێز) هیچ باکیان نیە بە نەبوونی... ئەوەی دەمێنێتەوە تەنها پارەیە، کە بە پارەکەشتان دەتوانن پارچە کفنێك بۆ مردنەکەتان بکڕن و بەس! !.. کاتێك کە تاوتوێی ئەو دونیا ڕەشەوەبووەی خۆمم دەکرد چەند کتێبێك لەبەردەمی بڵاوکراوە فرۆشەکەدا سەرنجی ڕاکێشام. دوو کتێب لە تەنیشت یەکتریدا دانرابوون ((ئەو پیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت)) و ((خۆمم دۆزییەوە)).

هەر بیریشم لەوە نەکردبوویەوە کە پارەم بیرچووە، ڕۆیشتم کتێبی ((خۆمم دۆزیەوە))م هێنا خاوەنی فرۆشگاکەش کە زانی حاڵم وایە و پارەم

پێ نییە، داوای نرخەکەی لێنەکردم. !... وا خەریکە خۆری تەمەنم ئاوا دەبێ و دەبینم چاکەیەك بەرامبەرم دەکرێ. سەیرە! لەم کۆمەڵگەیەدا کەسانی چاکە خوازیش هەن؟!!

چی دەبوو لەسەرەتای تەمەنمەوە ئەم چاکەیەم لەگەڵدا بکرایە و ڕێگەی دۆزەخم نەگرتایەتەبەر، بەڵام پاش چی! پاش تەواوبوون؟!

پاش ئەوەی هەموو شتێك کۆتایی هاتووە، تۆ بڵێیت چاکە مانایەکی مابێت؟.

نازانم بۆچی ئەم کتێبەم هێنا. کەسێك لە زۆراندا بێت لەگەڵ مەرگدا چی لە کتێب بکات؟ ئەوەشی کە نایزانم ئەوەیە لەوانەیە بەدوای ڕێگە چارەیەکی شاراوەی ڕزگاربووندا گەڕابم وەکو کەسێکی خۆ ون کردوو.

گەڕامەوە بۆ نەخۆشخانە. پزیشکەکان تەداوی لەسەر تەداویان بۆ دەکردم.

پزیشکێکیان: بۆ سەیری خۆت ناکەیت، لامان دەمێنیتەوە تا دەمریت و دەڕۆیت.

ئاخ! جا کوا ئەو ڕۆژەی بمردمایە، مەگەر مردنیش لە خۆیدا شتێکی باشە!...

هەم تەداوی ماددە هۆشبەرەکان و هەم چارەسەری شێرپەنجەم وەردەگرت. هەرچەندە ئەوان ئەوەیان لێدەشاردمەوە کە تووشی شێرپەنجە بوویم بەڵام هەرچۆنێك بێت بەهۆی ئەو دەرمانانەوە کە وەرمدەگرت تێدەگەیشتم، چ جیاوازییەك هەیە؟ ئەمڕۆ بێت یان سبەی بەهۆی ئەو کارە چەوتانەی لە ژیانمدا کردبوومن دەبوو تووشی هەموو دەردی سەرییەك ببم. هەر کە دەرمانە ئازار شکێنەکانم بەکارهێنا و لاشەم کەمێك ئاسوودە بوو، چاوێکم گێڕا بە کتێبەکەدا.. مەخابن.. چەند دەمێك

بوو کە کتێبم نەخوێندبووەوە؟! گەر وا نەبووایە ئێستا دەبوومە کەسێکی بەسوود بۆ خۆم و دۆست و وڵاتەکەم، تەنانەت دەبوومە یارمەتیدەر لە هەموو ئەو کێشە و لەمپەرانەی کە دەهاتنە ڕێگایان، ئاه بۆ ئەو گوناه و هەڵانەی کە لێبوردنیان نیە... لە کتێبی ((خۆمم دۆزییەوە))دا نامەگەلێکی زۆری تێدایە کە بۆ جەنابتان نوسراوە، دیارە کەسانێکی زۆر داوای یارمەتی و چارەسەری کێشەکانیانتان لێ دەکەن. زۆرم بەلاوە سەیربوو... وتم تۆ بڵێیت لەم دنیایەدا کەسێك مابێت دەستی یارمەتی بۆ لێقەوماوان درێژبکات؟.. کەواتە هەیە! بۆیە هەستم پێنەکردووە چونکە لە دنیایەکی زۆر جیاوازدا ژیاوم. بابەتەکانی کتێبەکە زۆر سەرنج ڕاکێش بوون، هەندێکیم خوێندەوە بەڵام فیکر و زیهنم نەیاندەتوانی بەرگەی ئەو هەموو ڕاستییە بێ گومان و حاشا هەڵنەگرانە بگرن...

لەو کتێبەدا نامەی کەسێك سەرنجی ڕاکێشام کە تووشی شێرپەنجە بووبوو. ئەو یەکێك بوو لە قوتابییەکانتان بە ناوی (ئەرەن تونجەر). لە ڕاستیدا ئەمە یەکەم نوسین بوو کە بە جددی کاریگەری لەسەرم دروست کرد، تا ئەو ڕادەیەی بووە هۆی ئەوەی ئاوێکی زیندەگی بە ڕۆحمدا بکات و کۆمەڵێك بەهام سەرلەنوێ تێدا زیندوو بکاتەوە و لە سوچێکەوە ژینی تاریکم ڕووناك بکاتەوە..

لەژێر کاریگەری ئەو نامانەی کە بۆ ئێوە نووسرابوون منیش تەکانێکی ئومێدم دایە بەرخۆم و داوام لەو خانمە کرد کە ژوورەکەمی پاك دەکردەوە چەند پارچە کاغەزو قەڵەمێکم بۆ بهێنێت تا منیش دەست بکەم بە نووسینەوەی ئەو ساتە پڕ لە ئێش و ناسۆرانەی ژیانم سا بەڵکو ئێوەش وەکو سەرگوزشتەی ژیانێك بیخەنە ناو کتێبەکانتانەوە، بۆئەوەی ئەوانەی دوای من پەند لە هەڵە و تاوانەکانم وەرگرن تا خۆیان بەدووربگرن لەو

کەسانەی کە دەست دەخەنە خوێنی کەسە بێناز و بێتاوانەکانەوە و ژیانیان هەپروون دەکەن.

من نازانم ئەمە چاکەیەکە یاخود ئاسوودەکردنی ویژدانی خۆمە، تەنها شتێك دەزانم ئەویش ئەوەیە کە شێرپەنجەکەم لەماوەیەکی کەمدا بەرەو مەرگم دەبات. ئەگەر ئەم نامەیە تەواو بکەم و بەنێوەی بگەیەنم ئەوا ناتوانم بڵێم کە کارێکی باشم کردووە، بەڵام تەنها شتێك هەیە ئەویش ئەوەیە کە دەتوانم بڵێم بە خستنە رووی ڕاستییەکان جۆرێك لە تۆڵەم لەوانە سەندووەتەوە کە ژیانمیان بەو گێژاو و تاریکییەدا برد...

# بەشی یەکەم

## ساڵە پڕ نەهامەتییەکانم



پوختەی ئەم بەشە:

سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەم یەك لەدوای یەك لەدەست دا.

کارەسات لەدوای کارەساتم بەسەر دەهات.

لەم دنیا پان و بەرینەدا بەتاقی تەنیا مامەوە، بەجۆرێك کە هیچ کەسم نەبوو یارمەتیم بدات و پشت و پەنام بێت. تەنها دڵنەوایی ژیانی منداڵیم ئەو فرمێسکانەم بوون کە هەرگیز، بۆ ڕۆژێکیش بێت، وشکیان نەکرد.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەرچی کێشەو خەمی دنیا هەیە خۆی مات دابوو و چاوەڕوانی من بوو...

# دایکمم هەرگیز نەدیوە

بەو ئومێدەی بەردەوام بن لە خوێندنەوەی چیرۆکی ژیانمدا، با لەسەرەتای منداڵیمەوە دەست پێبکەم... لە ڕاستیدا نامەوێت بگەڕێمەوە بۆ ئەو ڕۆژانە، چونکە ئەو ئازار و مەینەتییانەی ئەمڕۆ، بەرهەمی تۆوی چێنراوی دوێنێن. ئەگەر بە خەیاڵیش ئەو سەردەمە لەناوچووەم یادبکەوێتەوە هەست بە ئازارێکی بێ سنووردەکەم. هەر ساڵ و مانگ و ڕۆژێکی هەتا چرکەیەکیشی پڕ لە ئێش و دەردی سەرییە. لە هەمووی خراپتر ئەو بێ ئومێدیە بوو کە باڵی بەسەرمدا کێشابوو...

خێزانێکی چوار کەسی بووین. باوك و دایك، کوڕێك ساڵێك لە من گەورەتر و منی بەدبەخت. دایکمم هەرگیز نەبینیوە، نە بەری کەوتووم و نەهەستم بە سۆزو شەفەقەت و نەرم و نیانی دایك کردووە. بە هۆی ئەمەوە هەمیشە حەسرەتی بێدایکیم چەشتووە. لەوانەیە گەورەترین بەدبەختیم ئەوە بێت کە لە ژیاندا دایکمم نەناسیوە، تا دەرگاکانی دڵمی بۆ بخەمە سەرپشت و ببێتە یارمەتیدەرم. ئەگەر لەم بەندیخانەیەی کە پێی دەوترێت ژیان ئەوم لەتەکبایە کێ دەڵێت گرفتاری ئەم هەموو بەدبەختییە دەبووم؟.

ئەگەر کەسێکی وەك دایك ببوایە پەناگەیەك و لەچڕنووکی بێ ویژدانان پەنای دابام، لەوانەیە ئەمڕۆ لە سوچێکی نەخۆشخانەدا بە تەنها نەمامایەتەوە، بەڵکو خێزانێکی دڵشاد و منداڵی چاوگەش و هاوسەری ژینم ببوایە...

زۆر بیرم لەو تابلۆ ئارام بەخشەی ژیان کردووەتەوە، زۆرم خەون پێوە بینیوە بەڵام دروست نەبوو و نەبوو. چونکە کاتی لەدایك بوونم بەهۆی خوێن لەبەر ڕۆیشتنیەوە کۆچی کردووە و منیش ئەوەم کە ئێستا هەم!

دەڵێم منیش ئەوەی کە ئێستا هەم. دیارە، چونکە منداڵێکی تازە لەدایك بوو بە بێ نازی دایك لە لانەیەکی بچووکدا و ماڵێکی هەژار و کەم دەرامەت لە دەستی باوکێکی نەخۆشدا.. ئیتر ئێوە بیری لێبکەنەوە...

بیری دایك. تامەزرۆی فریشتە ئادەمییەکان. بە درێژایی تەمەنم لەخەیاڵم دەرنەچووە. گەورەترین حەسرەتی من نەبوونی خۆشەویستی و چاودێر بوو.

خۆزگە دایکم بمایە و کاتێك چەوتییەکم دەکرد قژی بگرتمایە و ڕایبکێشامایە و لە ژوورێکدا بەندی بکردمایە، قەیناکا با بە لێدانی باوکیشمی بدامایە، خۆ هیچ نەبێت نەی دەدامە دەست ئەو بێ ویژدانانە. چەند سەربەرز دەبووم...

سەرەڕای ئەو هەموو لێدان و ئازاردانە، پاشتر لەسەر کۆشی دایدەنام و قژمی شانە دەکرد و ڕوومەتەکانمی ماچ دەکرد، ئای دایە!.. چەندە خۆش دەبوو. من لەو هەموو نازە بێ بەش بووم.. ئای دایە!.. بۆ منت بەجێ هێشت و ڕۆیشتیت؟ بە بێ تۆ ئەم کچە بەدبەختەت تاوانی زۆری کرد. وای دەزانی هەموو کەس وەك خۆی نیاز پاکە. کەسانێکی زۆری ناسی وای زانی دۆستن، بەڵام بەپێچەوانەوە نەیاری زۆر سەرسەخت لە بەرگی دۆستدا بوون. دایە گەر تۆ بمایتایە دڵنیام نەتدەهێشت دەستیان بەر تاڵە قژێکیشم بکەوێت.

بیری دایك، خۆشەویستی دایك ناخمی وا سووتاند کە هەستی خۆشەویستیم لە ناوچوو. هەر کە بیرم لە خۆشەویستی دایك دەکردەوە،

یەکسەر پەنام بۆ ئەو شیعرانە دەبرد کە بۆ دایك وتراون. هەر شیعرێکم دەخوێندەوە هەوڵم دەدا ئەو بۆشاییانەی کە بەهۆی نەبوونی ئەوەوە تیامدا دروست بووە پێی پڕبکەمەوە. لە تەمەنی منداڵیمەوە لە هەر شوێنێکدا بە هۆنراوەیەك، یادگارییەك یان ڕاسپاردەیەکی دایك گەیشتبم یان لەبەرم کردووە یان لای خۆم هەڵم گرتووە و پاراستوومە. لەوانەیە تاکە کارێکی باش کە کردبێتم لە ژیانمدا ئەوە بێت کە ئەو شیعرانەی بۆ دایك وتراون کۆمکردوونەتەوە، هەر کاتێك تەنها بوومایە یاخود دڵتەنگ بوومایە یان برادەرێك یاخود دۆستێك بهاتایە لام، هەم دەمخوێندەوە و هەم دەگریام...

## هاوارم بۆ هەموو کچان

گەر هاوارم ببیستن دەمەوێت بە هەموو کیژانی لاو بڵێم: گوێم لێبگرن و ببیستن، ئاگاداربن دەست بگرن بە خێزانەکانتانەوە هەرچەندە دایکانتان هەندێ جار بەهۆی شتانێکی بچوکەوە بە زبری مامەڵەتان لەگەڵدا بکەن، یاخود بتان ڕەنجێنن... لەبیرتان نەچێت هەرگیز لەبیرتان نەچێت.!! بێزراوترین دایك لە هەرکەسێکی تر بەسۆزتر و نەرم و نیانترە بۆتان. خراپترین خێزان لە سەرنج ڕاکێشترین شوێن زامنترە، هەر هیچ نەبێت گیان و ناموستان لە مشتی دەست پاکاندایە. گەرنا ئێوەش دەبنە قوربانی دەستی ئەو دووڕووانەی کە بۆ گیانی ئێمەمانان هەردەم لە مەڵاسدان.

گەر بەمەبەستی دەسکەوتنی خۆشی و ڕەفاهیەت و سەربەستی خێزانەکانتان بەجێبهێڵن، ئەوە گەورەترین دڵخۆشی و سەربەستی لەدەست دەدەن و ڕادەستی ئەو کەسانە دەبن کە مرۆڤ وەك پارچەیەك گۆشت دەبینن. چونکە ئەوانەی لەودیو چاویلکەی پارە و بەرژەوەندییەوە سەیری دنیا دەکەن، بێ ئەوەی هیچ بەزەییان بە مرۆڤدا بێتەوە بەپێی

پارە دەپێپێون و مامەڵەی لەگەڵ دەکەن. بەڵام ئێوە پێویستان بە بینینی ئەو دنیا ڕووخاو و فرمێسکە ڕژاوانە نییە چونکە نزیکترین شاهید لەو ڕووداوانە منم. وەرن لە من بپرسن ئەو خائینانە چ بەهایەکیان پێ ون کردم...

داوای لێبوردن دەکەم مامۆستا... لە بابەتەکە دەرچووم بەدەست خۆم نییە...

ناتوانم زۆر چڕ ببمەوە لە بابەتێکدا. زیهنیشم وەکو هەموو باقی ژیانی لاوێتیم پەژموردە و پەرش و بڵاوە.

با بگەڕێینەوە بۆ سەرەتا...

لە لەدایک بووندا بووین، وایە؟

کە دایکم مرد، منێك کە تازە لە دایك بووبووم و برایەکم کە ساڵێك تەمەنی بوو و باوکم کە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنی دەژمارد و بە نەخۆشی (سی)یەوە دەیناڵاند، لە ماڵێکی دوو ژووری هاوشێوەی گەوڕ، دەست لەملانی ناخۆشییە کەمەرشکێنەکان دەماینەوە.

ماوەیەك کەسانێك کە دەیانوت: "نەدارن بەڵکو یارمەتییان بدەین" کۆمەکیان دەکردین، بەڵام لەکۆتایی دا وەکو دەیبینن.. خۆ کەسی نزیکت نیە تاوەکو لە دڵەوە بەردەوام بێت. دایکم لەبەر ئەوەی بە بێ کەسی و هەتیوی لەدایك بووبوو نە خزمێ نە نزیکێکی نەبوو. خزمەکانی باوکیشم وەك پور و مامم وەکو پێویست گرنگیان پێ نەداین و چاودێرییان نەکردین. خۆ مامم ئیفلیج بوو و زۆر نەژیا! پوریشم مێردێکی هەبوو بەردەوام سەرخۆش بوو و ڕۆژانە لە ماڵەوە هەر خەریکی جنێو و لێدانی پورم بوو... ئەی ژیان بۆچی هیچ بە ڕووی ئێمەوە پێناکەنیت، بۆ؟ وەك

دەبینن لەگۆڕەپانی ژیاندا دەستەویەخە و بە تەنها لەگەڵ ئازار و بەڵاکاندا مابووینەوە، هەمیشە وا هەستمان دەکرد کە بەرەو مردن بە ڕێ دەکرێین.

باوکم بەهۆی نەبوونی و هەژارییەوە زۆر بەرگەی نەگرت، سەرئەنجام بووە قوربانی هاوڕێی خراپ و چواردەوری بێ سوود و بەهۆی نەخۆشی (سی)یەوە کۆچی دوایی کرد. بەهۆی ئەو تاوانە زۆرانەی لە تەمەنی لاویدا کردبووی و جگەرەکێشانی زۆر و خواردنەوەی مەی و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان، تەمەنی لە بە بڕشترین کاتەکانی ژیانیدا کۆتایی پێهات.

بەتەواوەتی نەمزانی نەخۆشییە(سی)یەکەی باوکم چی بوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە جگەرەی زۆری دەکێشا و مەیی دەخواردەوە یەکێك لە خزمەکانمان وتی یان(شێرپەنجە)یە یان (سیل)ە. باوکی داماوم هیچ هەلی چوون بۆلای پزیشکی نەبوو، ئەویش وەك من چاوەڕێی قوتاربوون بوو لە نەخۆشییەکەی تا بە بێ کەسی ماڵئاوایی کرد...

باوکم خۆی فەرامۆش کردبوو و زۆریش کەم بیری لە داهاتووی خۆی دەکردەوە، ئەوەی پەیدای دەکرد لە سەر مێزی خواردنەوەکەی دای دەنا، هەر ئەمە وای کردبوو خێزانێکی زۆر داماو و هەژارو پەرتەوازە بین. بەڵام دایکم وا نەبووە، زۆر کەسێکی سەر ڕاست و دروست بووە، پەرستشەکانی بە ڕێکی ئەنجامداوە و هەمیشە لە ماڵەوە خەریکی قورئان خوێندن و موتاڵاکردنی تەفسیری قورئان بووە. واتە ئەو بەراورد لەگەڵ ئەوەی کە لە لادێدا ژیاوە و بەراورد بەو توانایانەی کە لە لادێدا بوونی هەبووە کەسێکی ڕووناکبیر و لێهاتوو بووە.

کاتێك زانیم دایکم دیندار بووە، هەرگیز لەو کەسانە بێزار نەدەبووم کە دینداربوون. تەنانەت لەودەمانەی کە لە لوتکەی بێ دینیدا بووم، هیچ بە کەم سەیرم نەدەکردن و قسەم پێ نەدەوتن، لەوانەیە گەر دایکم هەبوایە

ئەم دنیا بۆشەم نەبوایە و تانوپۆی هزری بێ باکی ئاوەزمی نەتەنیایە، لە ڕاستیدا ناتوانم بڵێم ئێستا لەسەر بیری بێ دینی و فاددە پەرستیم. نازانم گەر کەسێکی دیندار بوومایە خۆشحاڵ دەبووم یان نا؟ گەر لەم ساتە بە دواوە سوودێکیشی هەبێت ئیدی زۆر درەنگە بۆ کەسێك کە هیچ ئومێدێکی بە دنیا نەمابێت و هەمیشە لەبیری مردندا بێت، گەرچی ئەمە زۆر سەختە بەڵام ڕاستییەکە ئەمەیە...

نازانم لە مردن دەترسم یان نا! بەڵام دەمەوێت وا بنوێنم کە ناترسم و گوایە کەسێکی ئازاو بە جەرگم. واتە کە نەمتوانیوە هیچ کەسێك هەڵخەڵەتێنم تەنها خۆم خۆم هەڵدەخەڵەتێنم.

چەندە قورسە، چیتر مردن زۆر نزیکە لە منەوە. دڵنیام ڕۆژێك مردن ئەو دەرگایەم لێدەکاتەوە، ئەو ڕۆژەش زۆر نزیکە. لە ڕاستیدا مردن زۆر ترسناك و سامدارە، سەرەڕای ئەو ژیانە سەختە بەڵام وردە وردە بەرەو لێواری مەرگ دەڕۆم، چونکە وا هەستدەکەم سەرەڕای ژیان، هەموو ئومێدەکانم لە نەخۆشخانەدا بەرەو پووکانەوە دەچن. مادام وایە (شێرپەنجە) چی دەبێت؟ چیتر ئەشکەنجەی چاوەڕوانی مەرگم پێ مەچێژە و ژیانم بەرە. با ئەمە دوا چاکەت بێت. ! !

دیسان لە بابەتی سەرەکی لامدا؟ هەستی پێدەکەم...من بەم مێشکەوە زۆر لادەدەم تا ئەم نامەیە بە پایان دەگەیەنم...داوای لێبووردن دەکەم مامۆستا. خۆم پێ ڕاناگیرێ هەزاران کێشە و مەتەڵ لەمێشکمدا وەکو تۆپی یاری دێن و دەچن، دیارە لەبێ سەروبەری نووسینەکەوە هەستتان بەمە کردووە.

## دیسان با بگەڕێینەوە...

مامۆستا، پەرستارەکە لە ژوورەکەمدا ماوەیەکی زۆرە خەریکی پشکنین و لیّ وردبوونەوەیە و لەسەر سەرمەوە ڕاوەستاوە. ئەمە بۆمن وەك بۆنەیەك وایە و هەموو ڕۆژێك دووبارە دەبێتەوە، سەیری ئەو ژیانە بکەن ..ئەوان دەیانەوێت من ڕزگار بکەن و منیش لە ڕزگاربوون دەترسم. ئایا ڕزگارکردنی کەسێك کە لە ژیان بێزارە خراپەیەك نیە بەرامبەر ئەو کەسە؟. ڕەنگە بوونە کەسێکی خاوەن زانست شتێك بێت و بوونە مرۆڤیش شتێکی دی...

نازانم ئەو مرۆڤانە بۆ ئەوەندە خەم سارد و بیّ بەزەیین؟ بۆچی ئەم دکتۆر و پەرستارانە ئاوان؟ هیچ گرنگی بە مرۆڤ نادەن. ئەتەوێت شتێك بڵێیت قسەکەت پیّ دەگۆڕن. خۆ لەوانەیە چاکیان هەبێت بەلاّم چی، بۆ من نایان بینم و دەرکیان پیّ ناکەم؟

ناوەندەکانی خوێندنمان کەسانی زانست دۆست پیّ دەگەیەنن، بەلاّم مرۆڤ پێناگەیەنن. ناهەقی بەرامبەر هەموویان ناکەم، لەوانەیە لە هەندێکیاندا مرۆڤ پێبگات بەلاّم دەڵێی چی کە من نەمبینی؟ ناهەقمە مامۆستا؟...

## دوو پزیشکی جیاواز:

دەمەویّ ئەو ساتانەی کە لەگەڵ دوو دکتۆری جیاوازدا بردوومەتە سەر و تا ئێستاش لای کەس نەمدرکاندووە بە ئێوەی بگەیەنم.

## یەکەمین پزیشك:

### نمونەیەکی ناشیرین:

بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان و ئالودەبوونم بە خواردنەوەیانەوە، زامی قووڵ و سارێژ نەبوویان لەجەستەی شەکەتمدا بەجێهێشتبوو، بۆیە دەبوو لەژێر چاودێریدا بمێنمەوە. بە یارمەتی مامۆستایەکی قوتابخانەم لە کلینیکێکدا خەواندیانم. بەلام بەداخەوە یەکێك لەو پزیشکانەی کە چارەسەریان دەکردم مشتی لەمەڕ خۆش کردبووم.

گەر ڕاستییەکەی بڵێم، چ هەستێکی پاکی و جوانیم بوو هەموویی برد. بەلام بە هیچ جۆرێك قەبوڵی نزیکبوونەوەی ئەم شێوە بێزلێکراوەی ئەو پزیشکەم نەکرد، لە کاتێکدا من نەخۆشی سەرجێگابووم. گوایە دەیویست ببێتە هاوسەرم و بەختەوەرم بکات. بەتایبەتی لەگەڵ کەسێکدا کە ئالودەی ماددە بیهۆشکەرەکان بووبێت و تووشی نەخۆشی (سییەکان) بووبێت، کێ باوەڕ بەمە دەکات؟ ئەم درۆیانەمان زۆر بیست. هەر لەبەر ئەم هەڵخەڵەتاندنانە بوو کە شیرینترین ڕۆژەکانی لاوێتیم بۆ ئازار و مەینەتی گۆڕا. کە دکتۆرەکە بەردەوام بوو لەسەر بێزارکردنم، شکاتم کرد. بەلام هیچ باوەڕیان پێنەکردم. ڕۆژێك بێچارە مامەوە، دەستم کرد بە هاوار و گریان تا یەخەم بەردەن و وازم لێ بێنن، ئەوانەی گوێیان لێ بوو ڕایانکرد و هاتن بە دەممەوە. کە پزیشکەکە بە مەترسی ڕووداوەکەی زانی، بۆ ئەوەی خۆی لەمەسەلەکە بە پاکی دەربکات لەلایەکەوە سەرزەنشتی منی دەکرد و لەلایەکیشەوە وەك کەسێك کە ستەمێکی زۆری لێکرابێت و تاوانێکی بەرانبەر کرابێت هاواری دەکرد: ئەم کچە تێك چووە عەقڵی لەدەستداوە، تکایە ڕزگارم بکەن لەدەستی، دەیەوێت کەسێکی وەك من بخاتە ژێر گومانی ئێوەوە. !

بیربکەنـەوە چ ئـافرەتێکی نـەخۆش لەگـەڵ پزیشـکێکدا کـە تـەداوی دەکـات دەتـوانێ کـارێکی وا بکـات. چ عـەقڵ و مـەنتقێك ئەمـەی پـێ قبوڵ دەکرێت.

دەردەکـەت بـۆ کـێ بـاس دەکـەیت؟ دوو ڕۆژ دوای ئـەوە منـی سـتەم لێکـراو لـە کلینیکەکـە دەرکـرام، دواتـر ئـەو مامۆستایەشـم کـە یارمـەتی مانەوەمی دا لە کلینیکەکەدا هـیچ ڕوویـەکی پێنـەدام. لەوانەیـە سـەبارەت بەمن شتانێکی زۆر خراپیان بۆ باس کردبێت...

نەم دەتوانی هەڵسوکەوتی ئەو دکتۆرە بەهیچ جۆرێك لەیاد بکـەم و لـە مێشـکی خـۆمی دەربکـەم. دروسـت وایـە ئـەو نەخۆشـانەی چارەسـەریان دەکـات، نـەرم و نیـان بێـت لەگـەڵیان و یارمـەتییان بـدات. ئـاخر ئـەو لـە بەرامبەر ئەمەوە موچەی دەوڵـەت وەردەگرێـت.. گـەورەترین تـاوانم ئـەوە بوو هـەموو مرۆڤـەکانم وەکـو خـۆم دەبینـی. بـە هـەموو قسـەیەك بـاوەڕم دەکرد و نەم دەزانی لە پشـتی هـەر هەڵسـوکەوتێکەوە نیـازێکی خراپیـان هەیـە. ئـەوە گـەورەترین هەڵـەی ژیـانم بـوو. سـەبارەت بـەم مەسـەلەیە نامەیەکم بۆ وەزارەتی تەندروستی نارد و کێشەکەم تێگەیاندن بـەڵام هـیچ دەرئەنجامێکی نەبوو...

## دووەمین پزیشك

### نمونەیەکی جوان:

دیسـان بـەهۆی نەخۆشـی (سـی)یەوەلە نەخۆشـخانە کـەوتم. بـەهۆی یارمەتی بەڕێوەبەری ئوتێلێکەوە لـە نەخۆشـخانە خـەوێنرام و چارەسـەرم وەردەگرت. دەمویست سەرنجی ئەو پزیشکە لاوە بۆلای خۆم ڕابکێشم، کە بە کەسایەتی بەرزو مامەڵەی پـڕ ڕێـزی بووبوویـە مایـەی ستایشـی هـەموو

بەشەکان. بەڵام ئەو هەر هیچ گوێی نەدەدایە. وەلێ بەلەمی بیری من گەر بەئەندێشەش بێت لەنێو دەریای خەونە پەمەییەکاندا چارۆکەی واڵادەکردو بەبێ هیوایی بیری لە داهاتوو دەکردەوە. پزیشکەکە ئەوەندە خاوەن کەسایەتی بەرز بوو کە نەمدەتوانی هەستەکانمی لا دەربیڕم، ئەمەش بەهۆی ئەوەی دڵنیایی تەواوم هەبوو کە کەسێکی زۆر سەر ڕاستە و ئەو هەستانەش کە بەرامبەری هەمبوون تەنها خۆشەویستییەکی بەتاڵ نەبوو، بەڵکو لە باوەڕ پێ بوون و متمانەی ڕاستەقینەوە سەرچاوەی گرتبوو.بۆ یەکەم جار لە هەناومدا هەستم بە خۆشەویستی و ڕێزی ڕاستەقینە دەکرد. بە تایبەتی کە بەیانیان دەهات و دەیووت: "خوشکی خۆم چۆنیت؟" ئەو وشە ئەفسوناوییانەی ئەوەندە لەناخەوە بوون، ئەوەندە شیرین و دروست بوون لەوانەیە سەرسامی ئەوە بوویم کە تا ئێستا لەژیانمدا بەکەسی وا ڕاست و دروست نەگەیشتبووم. ئەم گفت شیرینییەی تەنها لەگەڵ مندا بەکارنەدەهێنا، بەڵکو هەمان ڕەفتاری لەگەڵ هەموو بیماراندا دەنواند. چیتر هەموو ئەو وشانەی کە دوای چارەسەر کردن دەیوتن لەبەرم کردبوون. ((ئارام بە... نەخۆشی تاقیکردنەوەیە إن شاء الله دەبێتە کەفارەتی تاوانەکانت. گەورەترین چارەسەر متمانە و ئومێدە)).

ئای خۆزگە هەموو کەس وەکو تۆ بووایە...

گەر ناسنامەی ڕاستەقینەی منی لا ئاشکرابێت داخۆ بە هەمان جۆر گرنگیم پێدەدات؟ یا بەجۆرێکی تر بیر دەکاتەوە کە پێویست بە یارمەتی دانی کچێك ناکات کە خۆی لە هەموو تاوانێکدا نقوم کردووە؟ ئەو چۆن بیردەکاتەوە نازانم، بەڵام من زۆر تینوو و ئاتاجی خۆشەویستییەکی ئاوها پاك و چاودێرییەکی نەرمونیان بووم لە ناخەوە هەستم پێدەکرد.

حەسرەتیشم دەكێشا! چونكە هەمیشە ببوومە قوربانی خۆشەویستی ساختەو درۆ.

دەردەچم.. كۆتا بەیانییە.. هاتە ژوورەكەم. وەكو هەموو جارێك كاتێك كە دەهاتە ژوورەوە پەرستارێكی لەگەڵ بوو چونكە هیچ كات خۆی بە تەنها نەدەهاتە ژوورەوە، یان لەگەڵ برادەرێكیدا یان لەگەڵ خانمی پەرستاردا دەهاتە ژوورەوە. لەوانەیە دەركی بەم حاڵەی من كردبێت بۆیە لەناو هەموو هاوپیشەكانی تریدا هەڵسوكەوتێكی نوێی پیشاندا.

بەمە دەستی پێكردو وتی:

– تۆ كچێكی زۆر باشی، تۆ دەزانی كە نەخۆشی منی واتە ڕاسپاردەی منی، ڕاسپاردەش داخوازی بایەخ و پاراستنە. ئێمە هەموو ئەو یارمەتییانەی لە دەستمان دێت بۆ كەسێكی بێچارە و ستەم دیدە درێغی ناكەین. جگە لەمە هەرگیز بیر لە شتێكی تر ناكەینەوە. گەر نا پێچەوانەی فەلسەفەی ژیانم دەبێت. منیش خوشك و خێزانم هەیە. خوای گەورە تۆڵەی هەر گوناهێك لە ڕەگەزی خۆی دەدات، بەلاَم إن شاء الله چاك دەبیتەوە، لەگەڵ كەسانی باشتردا داهاتوو پێك دێنیت، بۆ ئەمەش لای یەزدان نزات بۆ دەكەم.

بەڵێ كەسی ئاواش هەیە، هەردووكیان دەرچووی هەمان مەڵبەندی زانستی و هەمان وانەیان خوێندووە، بەلاَم ئەم جیاوازییە زۆرە بۆ؟

ژیریم چیتر ناتوانێت ئەمە شیكار بكات. بەلاَم دەمەوێت بەتایبەتی كچە گەنجەكان زۆر بە جددی ئەم جیاكارییە لەبەرچاو بگرن. چونكە ژیان هەموو هەڵەیەك هەڵناگرێت، هەندێك هەڵە هەن كاتێك هەستی پێدەكەیت كە لە جێگای مردندایت.

جاریَ واز لە نووسین دێنم لەگەڵ پەرستارەکەدا دەچم بۆ پشکنین، کە هاتمەوە دەست بە نووسین دەکەمەوە.

نامەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش لەسەر مێزەکەمدایە. لەگەڵ خێزانمدا ڕۆچووبووینە ناو قوڵایی نامەکەوە، زۆر سامدارە.. تەنانەت بە ئەندێشەش چوونە ناو ئەو ڕووداوە ئازار بەخشانەوە. بەتایبەت ڕووداوەکانی پاشتر.

ئێمەش نەمان توانی بەردەوام بین لە خوێندنەوە. بۆیە هاوسەرەکەم چوو تا شتێك ئامادە بکات بیخۆین. خۆ ئەگەر بتوانم بەدەم قومدانەوە لە قاوەکەم بخوێنمەوە بەردەوام دەبم.

دووبارە سڵاو مامۆستا. تا بنوسم گوڕ و تینم زیاد دەکات. کە هەست دەکەم کەسێك لێم تێدەگات و گوێ بیستی ئازارەکانمە خۆڕاگریم زیاد دەکات.

سەر گوزشتە و فیلمی ژیانم تێکچوو بوو، ئەوەی کە تروسکایی ئومێد بێت لێم نەدەکرا.

جا خۆ ئەمە ویستی من نیە؟ لەوانەیە ئەم سەرئەنجامە خراپە لە تەنگەژەی چاوەڕێکردن ڕزگارم بکات.. نازانم پێم خۆشبێت یان نا؟ گەر ئەم نامەیە تەواو نەکەم زۆر دڵتەنگ دەبم. ئەی دوای ئەوە؟ با چاوەڕوان بین...

## ڕۆژە تاڵەکانی بەشی ناوخۆیی

با بگەڕێینەوە بۆ تەمەنی منداڵیم... بەجۆرێك نەم توانی بگەڕێمەوە چونکە ئەوەندە ڕووداوی غەمگین و گیان بێزارکەر هەن کە دەبوو باسم بکردنایە، لەبەر ئەمە ناتوانم بگەڕێمەوە سەر کرۆکی بابەتەکە و لە بابەتێکەوە باز دەدەمە سەر بابەتێکی تر.

لەسەرەتای نامەکەمدا وتم کە ناتوانم نامەیەکی ڕێکو پێك بنووسم...

وەك دەبینن وا دەرچوو، هەروەك بلێیت ئەمە نامەیەك نیە بەڵكو كۆمەڵێك قسەی پڕوپوچ و وتەی بێ نرخ و ناوەڕۆكن.

دیسان من هەر سوورم، تاقی دەكەمەوە...

باوكی نەخۆشم بەهۆی نەبوونی و هەژارییەوە زۆر بەرگەی نەگرت، هەر بۆیە من و براكەمی خستە بەشی ناوخۆیی. لە كاتێكدا من تەمەنم ١ ساڵ و براكەشم ٢ ساڵ بوو. كاتێك بە خۆمان زانی كۆمەڵێكی زۆر لە منداڵ لە چواردەورماندا جەم ببونەوە. تا ئێوارە شەڕمان دەكرد و سەر و قژی یەكترمان ڕادەكێشا.

نە ڕوویەكی خۆش، نە ڕووخسارێكی بە خەندە و تروسكەیەكی دڵسۆزیم لەو دادەیەدا بەدی نەدەكرد كە چاودێری دەكردین. هەمیشە لێدان و قسەی ناشیرین بەشمان بوو.. ئا بەم جۆرە بەم بارە دەروونییە شێواوەوە چاومان بە ژیان هەڵهێنا... یەكەمین دزی لێرەدا فێربووم. لە منداڵیدا زۆر ئارەزوومەندی بووكەڵە بووم، جارێكیان بووكەڵەی یەكێكی دیم هەڵگرت، چوزانم كە ئەمە دزییەو بە بەدكاری لەقەڵەم دەدرێت، لەئەنجامی ئەمە چاودێرەكەمان چینێكی باشی لێدام. جاخۆ ئەوەندە لێدانم خواردبوو كە ئیدی ئەویش چاری نەدەكردم . باشە مرۆڤ بە لێدان دەگۆڕێت؟ نەخێر. زیاتر پێچەوانە دەجوڵێتەوە، زیاتر ڕەفتاری هەڵە دەكات، پتر سەركەشی دەنوێنێت، من ئەمە بە ڕێگایەكی زۆر هەڵە دەزانم. گەر مامۆستایان یان چاودێرەكان تێیان گەیاندمایە كە هێنانی ماڵی كەسێكی تر بە بێ پرس بە دزی دەژمێردرێت، پێدەچێت من تووشی ئەم ناخۆشییانە نەبوومایە.

لەگەڵ ئەوەدا كە لە پیشەی مامۆستایی و پەروەردەكاری نازانم، بەلام ئەم ڕێگەیە بە ڕێگەیەكی چاك نازانم. چونكە كە لێیان دەدام زیاتر هەوڵی

دزیم دەدا، کە قسەی ناشیرینم دەبیست زیاتر لاسار دەبووم. هۆکاری سەرەکیش بۆ ئەمە خاڵی بوونی ئەو مامۆستا و چاودێرانە بوو لە هەموو هەست و سۆز و خۆشەویستییەك. ئەمێستاکە بۆم دەرکەوتووە هەموو ئەوانەی لەو پێگەو کایە پەروەردەییانەدا ڕۆڵ دەبینن، پێویستە پارچەیەك بن لە ئەوین و میهرو سۆز، دەبێت خۆشەویستییەکی زۆر و سۆز و بەزەییان هەبێت. چونکە کەسێك سۆز و خۆشەویستی بۆ بەرامبەرەکەی نەبوو چۆن دەتوانێت لەسەر خۆشەویستی گۆشیان بکات. هەرچۆنێك بێت ئێستا کاتی پیتۆڵ کاری نیە..

کە تەمەنم گەیشتە ٥-٦ ساڵ زیاتر لەگەڵ براکەمدا چاودێری یەکترمان دەکرد. سەرەتا باوکم زۆر دەهات بەلام دواتر هاتنی بۆ لامان کەم بووەوە. دەیوت کارم زۆرە ناتوانم. لە دوایدا دەرکەوت کەنەخۆشی ڕێگر بوو لە هاتنی ..

هەرکات سەردانی بکردینایە مێوژ و نۆکاو و کێکی بۆ دەهێنایین، بڕێ جاریش هەندێ پارەی وردەی دەداینێ، بەلام هیچ سوودمان لەو پارانە نەدەبینی چونکە چاپووکانە لێیان دەدزین، وەنەبێت ئێمەش ئەوەندە سالار بووبێتین! ئێمەش ئەو بەد خوویەمان گرتبوو. براکەم کە ساڵێك لەمن گەورەتر بوو، زۆر هەستیار بوو زۆر زوو دەگریا، کاتێك هەستی بە ڕووداوەکان دەکرد چاوانی پڕدەبوون لەئەسرین. بەلام من وا نەبووم کەمێك سارد و سڕ و تا بڵێی سەرکەش بووم. ناخۆشترین شت بەلامەوە ئەوە بوو دوای ئەو هەموو هەڵسوکەوتە بێزارکەرەیان لەگەڵماندا دەهاتن ئامۆژگارییان دەکردین. هەندێ جار میوەیان بۆ دەهێنایین، براکەم نەیدەخوارد دەیهێنا بۆ من و دەیوت: "من کوڕم لە هەرشوێنێك بێت

دەستم دەکەوێت" بەڵام تۆ ناتوانیت لەهەموو کەس داوا بکەیت. ئای برا شیرینەکەم تۆ چەندە بەسۆز و بیر فراوان بوویت...

ببورن، ناتوانم ئەم دیمەنە بنووسم، هەر کاتێك براکەمم دێتەوە یاد دەروونم پارچەپارچە دەبێت. ئەو تەنها هاوڕێ و پەناگە و دۆستم بوو لە ژیاندا...

چی بوو؟ گەر بتوانم ئەوەشتان بۆ باسدەکەم.

لە تەمەنی حەوت ساڵیدا بۆ پۆلی یەك دەچووم و براکەشم کە هەشت ساڵان بوو بۆ پۆلی دوو دەچوو، براکەم بەهۆی ئەوەی سەرمای بووبوو نەخۆش کەوت یەك دوو ڕۆژێك نەیتوانی بێتەوە بۆ قوتابخانە، هەربۆیە لە بەشی ناوخۆیی دەمایەوە.

## تاقانە هاوڕازەکەشم لەدەست چوو

کە لە قوتابخانە گەڕامەوە سەر لە ئێوارە بوو، چی ببینم خودایە !، بانیژەی ژیانم ڕووخا، تەمی ماتەم ئاسۆی بەرچاومی لێڵ کرد، مۆمی تەمەنم کوژایەوە و سەرتاپا تاریکی ژینمی داگیر کرد ...

ئاه.. ژیان تۆ چەندە بێ بەزەییت، من چیم لە تۆ چەشت و چیت پێبەخشیم؟ وا لە منیان گەیاند کە براکەم لە سیسەمەکەیەوە کەوتووەتە خوارەوە و سەری داویەتی بە ئاسنی سیسەمەکەدا، مەخابن خوشکە تاقانەکەی بەجێهێشت. ! !

وەرە بەرگەی ئەو هەموو ئازارە بگرە ! بەو منداڵییە چۆن توانای بەرگە گرتنت هەیە؟ چیتر بە چ هێز و ئومێدێکەوە دڵ بە ژیان خۆشکەم؟ وەرە و بەتەنها ڕووبەڕووی ئەو هەموو تەنگژەیە بەرەوە !

گەورەترین خاڵی تێکچوونی ژیانم، یەکەمین ئەوەی دایکم بوو کە هەر هیچ نەمدیبوو، دووەمین دۆستی ژیانم، هەموو شتێکم، پەناگەم، برا

ئازیزەکەم، ئای گەر ئەو مابایە، دڵنیام لێرەدا نا بەڵکو وەکو شاژن لانەیەکی بەختەوەر و ئاسودەم دەبوو. گەر ئەو بمایە کەسێکی خاوەن ئەرزش، شەرەف و نەفس بەرز دەبووم و نەدەبوومە نێچیری ئارەزووی هیچ دڕندەیەك.

مامۆستا، ئێستا بڵێسەی گڕێکی سوتێنەر لەهەناومدا کڵپەی سەندووە! ئێوە دەزانن گڕی هەناو چییە؟ گڕی هەناو لە پشکۆی ئاگر سوتێنەرترە، تەنها ئەوانە دەیزانن کە ناخی سوتاندوون! ئێستا دەستەکانم دەلەرزن... دیسان خێرایی دڵە بێ هێزەکەم زیادی کردەوە، ئەو چاوانەی بە گریان ڕاهاتوون دیسانەوە فرمێسك دەڕێژن. چی بکەم ئەمە چارەنووسی منە...

گریان گەورەترین چەکی منە. گەورەترین چەکی بێ دەسەڵاتەکان لە فرمێسك زیاتر دەبێت چی بێت؟... مامۆستا کەمێك پشوو دەدەم زۆر ماندووم.

بەڵێ، ماندوو نەبوون چ گونجاوە؟ منداڵێك لەو تەمەنەدا چۆن بتوانێت بەرگەی ئەو هەموو بێ دەرەتانییە بگرێت؟.

لەبیرمان چووبووەوە کە قوم لە قاوەکەمان بدەین، ئێمەش لە ناو ئەو هەموو خەمەدا ڕۆچووبووین. هەوری ماتەم ئاسمانی دەروونی تەنیبووین، بە تایبەتی خێزانەکەم کە بە هیچ جۆرێ خۆی پێ ڕانەدەگیرا، خودایە کەس تووشی ئەم ئازارانە نەکەیت.

خێزانەکەم هەستا قاوەکەی تازەکردەوە. منیش بۆ ئەوەی تۆزێك بێمەوە سەرخۆ کەمێك لەمێزەکەم دوورکەوتمەوە.

پاش ئەوەی کەمێك هاتینەوە سەرخۆمان، دەستمان کردەوە بە خوێندنەوەی نامەکە:

ئیتر لە بەشی ناوخۆیی تەنها بووم. هەموو رۆژێك و هەموو ساتێك دەگریام، جا چ جۆرە گریانێك، چ جۆرە كڕوزانەوە و لالآنەوەیەك! بە تەواوەتی جەستەم لاواز ببوو. بەهۆی ئەو هەموو گریانەوە چاوەكانم دوچاری هەڵئاوسان بووبوون، هەربۆیە بردمیان بۆ لای پزیشك. بەلآم ئەو كەسانەی چواردەورم زۆر بێ هەست بوون، هیچ سۆز و خۆشەویستییەكیان بۆم نەبوو، لە باتی دڵدانەوەم لەگەڵ هەموو گریانێكمدا ڕێگەی ئازاردانیان دەگرتەبەر، لەبەر ئەوەی زۆر لێیان دەترسام نەمدەهێشت كە زۆر هەستم پێ بكەن. لە ناو مامۆستاكاندا تەنها مامۆستایەكیان تیابوو كە لە دەردم شارەزا بوو و سۆز و شەفەقەتی بەرامبەرم دەنواند، بەڕاستی كەسێكی ڕێك و پێك بوو. دەهات بۆ لام گوێی لێدەگرتم و گرنگی پێدەدام و چیرۆكی بۆ باس دەكردم و كتێبی دەدامێ. كەسێكی تا بڵێی خۆشەویست بوو. دواتر لە بەشی ناوخۆیی دووریان خستەوە، لە بەرچی بوو، نازانم. ئەم ڕووداوەش بەڕاستی خەم و پەژارە بەخش بوو.

هەر لە بەشە ناوخۆیەكەدا (كاك عوسمانی كالۆریفەر)ی لێبوو. بەڕاستی ئەویش تا بڵێی خۆشەویست و بەسۆز بوو، هەموو رۆژێك شیرینی بەسەردا دابەش دەكردین پێی دەگوتین: ((گوڵەكانم، دڵەكانم)).لەناخەوە خۆشی دەویستین. گەورەترین هەژان لە ژیانمدا ئەوكات كە تەمەنم دە ساڵان واتە لەپۆلی سێ بووم بەرۆكی گرتم. باوكە بەڕێوبەر بانگی كردم. قوتابیانی بەشە ناوخۆییەكە بە بەڕێوبەریان دەوت ((باوكە بەڕێوبەر)).

چووم بۆلای بەڕێوبەر، بردمیە ژوورەكەی خۆیەوە یەكەم جاربوو هەست بكەم گرنگیم پێدەدات و خۆشەویستی بەرانبەرم دەنوێنێت. بەڕوویەكی گەش و زوبانێكی شیرینەوە پێشوازی لێكردم، تێنەدەگەیشتم

لەو بارەی کە تێی کەوتبووم. لە پێشدا لـە پێوستـی و کەموکوڕییـەکانمی پرســی، پێشــی دەوتم مەترســە کچـم دەبینــە یارمــەتی دەرت. منــیش پێداویستییەکانی ئەو ڕۆژەم بۆ باسکرد. وتی زۆر باشە هەموویت بۆ دابین دەکەم. پاشتر وتی تۆ کچێکی ئازا و بەتوانایت و زۆر بـاوەڕم پێـت هەیـە. داهـاتوت زۆر ڕوون و پرشـنگدار دەبێـت و بەسـەر هـەموو ئاسـتەنگەکاندا سەردەکەویت.

ئێ.. هەموو ئەمانە بۆ چی بـوو؟ تێنەدەگەیشـتم، مـن ئەوەنـدە ئـازا و نەبەردیش نەبووم کە... سەرەنجام بۆمبی کەساسی و کارەسات بەسەرمدا تەقییەوە، ئومێدم هەپروون هەپروون بوو، فەرمانی مردنم هەر لـە تەمـەنی دە ساڵیدا واژوو کرا.

– کچـی خـۆم زۆر دڵتـەنگم، بـەڵام ناچـارم دەبـێ بیزانیـت... باوکـت مــردووە ! هێشــتا کۆتــا وشــەی تــەواو نــەکردبوو مــن بورابوومــەوە لــە ژوورەکەدا. لەوکاتەدا وام هەست دەکرد هـەموو دار و دیـوار و پەنجـەرە و دەرگا و مێزی ئەو ژوورە کەوتووە بە سەرمدا، هەر ئەوەندە ئاگام لە خۆم بـوو کـە ڕووناکییـەك پەیـدا بـوو لـە ژوورەکـەدا و برامـە دەرەوە. دواتـری نازانم.

کاتێ هۆشم هاتەوە سەرخۆ دوو کەسی کـراس سـپیم بەسـەر سـەرەوە بوون، قۆڵم سڕبوو بوو، مێشکم خاڵی و ئـازارێکی بـێ ئەنـدازە لـە گیانمـدا هاتوچـۆی دەکـرد، گـڕی زامێکـی قـووڵ هـەموو لایـەکمی دەسـووتاند. تـا ئەمڕۆش لە ناو ئەو گڕەدام کە ژیانمی پارچە پارچە کرد...

بـەس ئـەو درامـا تراژیدییـە بێننـە پـێش چـاوی خۆتـان کچـێکی دە ساڵان... دایکی، باوکی، براکەی نەمابێت لە ژیاندا بەتەنها کەسـێك نـەبێت بیگرێتە خۆ، کەسێك نەبێت کەمێك دڵـی بداتـەوە و سەرەخۆشـی لێبکـات،

بیربکەرەوە گەر لە ژیاندا وابویتایە دەبوو چیت بکردایە؟ زۆر هەست بزوێنە زۆر، وا نیە؟ تەنانەت بیرلێکردنەوەشی بەسە بۆ ئەوەی ئاسوودەیی لەدڵەکان زەوت بکات.

چەندەها ڕۆژ بە برسێتی و تینویەتی مامەوە، خۆم کەنارگیر دەکرد لە خەڵك و کزۆڵ کزۆڵ دەگریام. زۆر لاواز بووم و ئەو ساڵە نەمتوانی بچمەوە بۆ قوتابخانە.

وەرە هیچت نەخواردبێت، نەخۆش کەوتبی، نەچووبیت بۆ قوتابخانە، بەکێ چی؟ ئەوەی ڕووی دەدا تەنها بۆ من بوو.. لەو ساڵانەدا تەنها کەسێك کە سەرچاوەی دڵخۆشیم بووبێت(کاك عوسمانی کالۆریفەر)بوو. هەموو ڕۆژێك دەهات و دەیدۆزیمەوە و شیرینی بۆ دەهێنام و دەستی دەهێنا بەسەرمدا، هەمیشە بە وشە ناسك و شیرینەکانی کە دەیگوت: ((شیرینەکەم، گوڵەکەم)) ئاسودەیی پێدەبەخشیم. چ بکەم لەناو ئەو خەمباری و بێ نازییەدا تەنها (کاك عوسمان)م هەبوو. تا ئەمڕۆش بەرێزەوە یادی ئەو ڕۆژانەی کاك عوسمان دەکەمەوە.

بەڵام هیچ کات گەردنی بەڕێوەبەر ئازاد ناکەم، چونکە دوای ئەوە هیچ بانگی نەکردم، هیچ گرنگی بە دەرد و ئازارم نەداو ئەو بەڵێنانەی نەهێنایە دی کە پێی دابووم. نازانم بۆچی مرۆڤی وا دەکەنە لێپرسراوی ئەو شوێنە هەستیارانە! هەموو ئەو منداڵانە ئاتاجیان بە خۆشەویستی و گرنگی پێدانە. پێویستە کەسێك بێت بە لایەنی کەمەوە بتوانێت نازیان هەڵبگرێت و پێداویستی ئەو منداڵە بێنازانە لە خۆشەویستی و سۆز و نەرمی نواندن دابین بکات.

هەر لەو ساڵەدا ڕووداوێکی تر تەوژمی ژیانمی بەئاڕاستەیەکی تر گۆڕی، ئەویش ئەمە بوو: ڕۆژێکیان زۆر برسی بووم، هەر بەم هۆیەوە چوومە

چێشتخانەکەوە و نانێك و پارچەیەك پەنیرم هێنا. لەبەرئەوەی پارەم پێ نەبوو نەمتوانی لە حانوتەکە بیکڕم. کاتێك ویستم بێمە دەرەوە چێشت لێنەرەکە (کاك کامیل) پێی زانیم و قۆڵی گرتم و بردمی بۆ لای بەڕێوەبەرەکەمان. ئەویش سوکایەتی و سەرزەنشتێکی وای کردم کە بە هیچ کەس نەکرابێت، تەنها لەبەر لەتێ نان و پەنیر....."دزینە، بێ ڕەوشتییە ..." بەم وشە ناشیرینانە کەوتە سوکایەتی پێکردنم، چ سوکایەتییەك!! ئێستاش کە ئەو ڕووداوەم بیردەکەوێتەوە ڕووم سوور هەڵدەگەڕێ و پەژارەیەکی زۆر دام دەگرێ.

ئەم کەسانە چ جۆرە پەروەرشیارێکن؟ ئایا هیچ لە دەروونی منداڵ شارەزان؟ هەرگیز منداڵەکانیان ناهێننە پێش چاوی خۆیان؟ برسیم بوو. پارەم نەبوو...

گەر ئەوکارەی کردبووم لە دەرەوەی یاساش بووایە نەدەبوو بەزمانێکی شیرین تێم بگەیەنن کە ئەوە هەڵەیە؟!

ئەم هەڵسوکەوتە نەدەبوو هیچ کات کەسێکی پەروەردەیی بیکات. پێویستە ئەوانەی کە دەبنە پێشەنگ بۆ کەسانی تر زۆر جیاواز بن. گەر نا ئێمە کێ بکەینە پێشەنگ بۆ خۆمان. مامۆستا چیدی ئەمانە دادم نادەن.

##ساڵانی ناوەندیم

ژیانی ناوەندیشم زۆر لەمە جیاواز نەبوو، بەڵام هەموو ئەوانەی دەورووبەرم بە تایبەتی مامۆستاکانی قوتابخانەم زۆر باسی زیرەکی منیان دەکرد.

لەو ساڵانەدا دوو ڕووداوی تر لەسەر سەکۆی ژیانم خۆیان نمایش کرد. دەمەوێ سەرنجتان بۆ لای ئەو دوو ڕووداوە ڕابکێشم، یەکێکیان بەم شێوەیە بوو:

هاوڕێیەکم بەناوی (عائیشـە) بـاوکی زۆر دەوڵەمەنـد بـوو. لەبـەر ئەمـە هەمیشە جلی جـوانی دەپۆشـی و خـەرجی زۆری دەکـرد. هـەموو پشـووی وانەیەك دەچوو بـۆ کافتریا شـتی دەخـوارد و منـیش لـە دوورەوە سـەیرم دەکرد و ئیرەیم پێی دەبرد چونکە هیچ پارەم پێنەبوو.

ڕۆژێکیان جووتێك کالەی زۆر جـوانی کـڕی بـوو، منـیش کـە بینـیم زۆر حەزم لێکرد. بە بیرم دێت چووم لە سوچێکدا تێرتێـر بـۆی گریـام. یەکـەم تاوانێـك کـە لـە ناخمـدا هەسـتم پێکردبـێ لـەو ڕۆژانـەدا تووشـی بـووم. مامۆستای وانەی تورکیمان باسی بیری مارکسیزم و بێ دینی بۆ دەکردین. یەکەمین کەسێك کە بویـە هـۆی تێـوەگلانم بـە فیکـری (مارکسـیزم) و بـێ دینـی، مامۆسـتای وانـەی تورکیمـان بـوو. مامۆسـتای وانـەی تورکیمـان بـەردەوام هێرشـی دەکـردە سـەر موسـوڵمانان و دیـن و ئیمانیـان و باسـی مارکسیزم و بێ باوەڕی بۆ دەکردین، گرنگی زۆریشی بەمە دەدا. لەهـەموو وانەیەکـدا ئەوەنـدە سـوکایەتی بـەدین و خـودا دەکـرد کـە بـە بۆچـوونە پووچـەکانی ئێمـەی لـەو تەمەنـە بچـووکەدا خسـتبوویە ژێـر کاریگـەری خۆیەوە.

مامۆستا (ئەردالّ) قوتابییەکانی لە بەشی ناوخۆییدا کـۆدەکردەوە یـان ئێوارە دەهات بۆ لامان، کە دەشهات میوە یان نەسـتەلەو قـاوەی دەهێنـا لەگـەڵ خـۆی و بـە سـەرماندا دابەشـی دەکـرد. ئێمـەش لـە خۆشـیدا هەڵدەبەزینـەوەو، هـەموو بەیەکـەوە بـە یـەك دەنـگ هاوارمـان دەکـرد: "خۆشەویسترین مامۆستایە مامۆستا ئەردالّ".

دەیهێنایین لە تەنیشت خۆی دایدەنیشاندین و گرنگی زۆری پێـدەداین و دواتر دەستی دەکرد بە قسەکردن. زۆر جوان و کاریگەرانە قسەی دەکـرد. بە تەواوەتی قسەکانی ڕووی لـە نـاخی ئێمـە دەکـرد و پەنجـەی دەخسـتە

سەر یەك بە یەكی برینەكانمان، چونكە هەموو ئەو كچانەی كە لەویٚ بوون بیٚ كەس و بیٚ ناز یان هەتیو بوون و پێویستیان بە زۆرترین خۆشەویستی و گرنگی پێدان بوو، مامۆستاكەشمان لە بەكارهێنانی ئەمەدا زۆر شارەزابوو.

ئێستا بیر لەوە دەكەمەوە كە مامۆستا (ئەردالْ) چەندە هەولْی ئەوەی دەدا ئەو شتانەی لە مێشكماندا بوو دەربارەی خوا و پێغەمبەر و دین و ئیمان و قورئان بیسڕێتەوە... ! مرۆڤ یەكجار دێتە دونیاوە..منداڵینە بە ئارەزووی خۆتان بژین..لە كەس مەترسن، سەربەست بژین، كاتێك لە ژیاندان تامی ژیان بكەن، لەبیرتان نەچێت بۆ ئەوەی بە یەكسانی بژین و كەس مافی كەس پێشێل نەكات كۆتایی بەم سیستەمە نایەكسانە بێت، پێوستمان بە سیستمێكی كۆمەلاَیەتی بەهێزە و، ئێمەش لە پێناوی داهاتوویەكی گەش بۆ ئێوەدا هەمیشە لە هەولْداین، گەر ئەو ڕۆژانە هاتن، هەموو كەس یەكسان دەبێت و كەس مافی كەس زەوت ناكات.

زۆر زوو كەوتینە ژێر كاریگەری ئەم بۆچوونانەی مامۆستاوە. ئێمەش كە خاوەنی پاشخانی بۆچوونێكی دینی بەهێز نەبووین لە ماوەیەكی زۆر كەمدا وامان لێهات كە شانازیمان بەو بیرەوە دەكرد.

بەلاَم پێویستە دان بەوەدا بنێم بابەتێك هەبوو ئەویش ئەوەی ئایا كە مرۆڤ بوو بە خۆلْ دووبارە چی لێدێت، واتە زیندوو بوونەوەی دوای مەرگ كە هەمیشە وەك سەدایەك لە ناخمدا دەزرنگایەوە و تێنەدەگەیشتم كە ئەگەر زیندووبوونەوە و لێپرسینەوەیەك هەبێت ئەمە چۆنە؟ كەسێكیش نەبوو كەمێك ڕوونكردنەوەم بداتیٚ لە سەر ئەم بابەتە...

دووەم ڕووداو ئەوە بوو كە لەگەلْ مامۆستای وانەی (ئایین)ماندا ڕوویدا.

لە پۆلی دووەمی ناوەندی بووم. مامۆستای وانەی ئایین لە حاڵم تێگەیشتبوو و زۆر گرنگی پێدەدام. هەندێ جار دەهات هەر پێداویستییەکم ببوایە بۆی دابین دەکردم، بە تایبەتی لەجەژنەکاندا خەرجی دەدامێ. ماوەیەك بە هۆی هەڵسوکەوتی جوانی ئەو مامۆستایەوە خۆشەویستی خواو دین و قورئان لە دڵمدا چەکەرەی کرد، دەتوانم بڵێم یەکەمین تێگەیشتنم بۆ دین لەو کاتانەدا بوو. بەڵام سەد داخ بە هۆی ڕووداوەکانی ڕۆژگارەوە ئەم بارە زۆری نەخایاند. هەمیشە ئەو مامۆستایەم هانی دەدام بۆ خوێندنەوە و سەرکەوتن. پێی دەوتم تۆ دەبێت سەرکەوتوو بیت، ئەوە تاکە ڕێگەچارەی تۆیە گەر نا چارەی دیکەت نییە. یان دەبێت سەرکەوتوو بیت یان لە ناو زەمبەلەکی ئەم ژیانەدا دەشێلرێیت و دەڕۆیت، ژیان بۆ کچێکی تەنها زۆر ئەستەمە، لەبەر ئەوە دەبێت زۆر بەهێز بیت، هەر لەبەر ئەمەشە دەبێت باشترین خوێندنگە و باشترین خوێندنت هەبێت، گەر هەوڵ بدەیت ئەمە بە دەست دەهێنیت، لەبیرت بێت گەورەترین داڵدەی بێ نەوایان خوای گەورەیە. ئەو هیچ کات ڕەنجی بەندە نیەت پاك و بێگەردەکانی و هەوڵەکانیان بێ هودە ناکات.

دڵنیا بووم کە هەموو ئەو شتانەی مامۆستاکەم دەیوت دروست بوون. بەڵام ڕێکاکانی ژیان ئەوەندە پێچاوپێچ بوون و ئەوەندە لێژییان تێدا بوو کە بەرەوە خواریان بردم، بە جۆرێك نەم توانی بەو ئامانجەم بگەم کە مامۆستا بۆی دیاری کردبووم، یاخود خاوەنی دەوروبەرێك یان توانایەك نەبووم کە یارمەتیم بدەن بۆ هێنانە دییان. گەر ئەمڕۆش بەو مامۆستایە بگەمەوە کە لەو ڕۆژە تەنگانەدا یارمەتی دەرم بوو بە هەمان گوڕی خۆشەویستییەوە بەرەو ڕووی دەچم، چونکە تا ئێستاش لە ناخمدا هەندێ خۆشەویستی و سۆزی دەگمەن ماوەتەوە کە تایبەتە بەوەوە.

– ماندوو بووم کەمێك پشوو دەدەم هەرچەندە درەنگە، گەر بێمەوە سەر خۆم، ئەوە درێژەی پێدەدەم گەر نا ئەم نامەیە ناگاتە دەستی بەڕێزتان.

بۆ ئێمەش کات درەنگ بوو، شەو بوو، بەڵام بە جۆرێك نەمان دەتوانی واز لە نامەکە بهێنین. وەها نامەکە خستبوینیە تێڕامانەوە کە بواری هیچ شتێکمان نەبوو.

بە خێزانەکەم وت:

– با ئێمەش تا پارشێو پشوو بدەین.

– وتی: نەخێر، گەر پشوش بدەین من خەوم لێناکەوێت. دەبێت نامەکە تا کۆتایی بخوێنینەوە.

– هیچ نەبێت باماوەیەك پشوو بدەین تا کەمێك چالاك بینەوە.

وامان کرد، هەم ئەوەی کە خوێندبومانەوە شیمان دەکردەوە و تاوانبارەکانمان دەستنیشان دەکردن و ئەو پێویستی و ئەرکانەی لە ئەستۆی کار بەدەستاندایە لە گەورەوە بۆ بچوك دەمانخستە بەر ڕەخنەو هەستی بەرپرسیارێتی.

دواتر دەستمان کردەوە بە خوێندنەوەی :

بە "دووبارە سڵاو مامۆستا" دەستی پێکردبوو.

# بەشی دووەم

## قوربانیی دەستی تەنیایی

## ( ساڵانی دواناوەندیم )



**پوختەی ئەم بەشە:**

زۆر تەنیاو بێهاوکار و پشتیوان بووم لەبەرامبەر فێڵ و داوە پڕ مەترسییەکانی ئەم ژیانە تاڵەمدا. خەیاڵ و خولیا گەنجانەکانم وایان کردبوو کە زۆرێك لە ڕاستییەکان نەبینم. لەبەر بێ ئەزموونیم توانای جیاکردنەوەی ڕاست و هەڵەکانم نەبوو.

لەبەرئەوەی کەوتبوومە نێو ژینگەیەکەوە کە دەورووبەرم بە مرۆڤە خراپ و نیاز پیسەکان گیرابوو، زۆر زەحمەت و سەخت بوو بۆ منێکی تەنیا کە بەرگەی ئەو بارودۆخە بگرم. پێش ئەوەی چاوم بە ڕووناکی ژیان بکەوێت، تاریکی و نائومێدی دەورووبەریان تەنیم...

# لە گەڵ دووڕوواندا

لە کوێدا وەستام لە وێوە دەست پێدەکەم:

باسی سەردەمی دواناوەندی دەکەم...

دواناوەندیم ... ئاه ئەو سەردەمە... ئومێدەکانم پێش ئەوەی چرۆ بکەن پووکانەوە، ئەو سەردەمەی بوومە دیلی تاوانەکانم ...

چی دەبوو گەر ئەمە خەونێك بوایە و کاتێك لە خەو هەڵبساما یە ڕۆشتبووایە و نەم دیتبایەتەوە، با ئەو ساڵانە هیچ نەژیامایە، نازانم ئەو دووڕووانەی دڕندە ئاسا پەلامار دەدەن و گوێ نادەنە ئەو هەستە پیرۆزانە چییان لێ دەویستم؟

زۆر بیر لەوە دەکەمەوەو دەڵێم با لە شوێنێکی چۆڵدا، لەدۆڵێکدا بە نەخوێندەواری بمامایەتەوە و لە ناو کۆمەڵێك ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزندا، لەناو خانوویەکی ڕووخاو و لەگەڵ چەند منداڵێکی لاسار و هاوسەرێکدا کە هەر هیچ نەبێت لێم حاڵی دەبوو، زۆر سادە ژیابام! بەڵام چی لەم ژیانە بکەم هەرچەندە بەناو بە ئاگا و ڕۆشنبیرم! بەڵام ئومێدەکانم وەك شەختە سەهۆڵ بەستویانە، ئەو ژیانە نەبوو!... کە نەشبوو نازانم ئێستا ئەم خەیاڵاتانە بۆ دەکەم. پێدەچێت ئەو هەست و تاسەیە لە ناخمدا شاراوە بێت، هەندێ جار زیندوو دەبێتەوە. قسەیەك هەیە دەڵێت: ((تا گیان دەرنەچووبێت ئومێدی هەر تێدایە)) گەر بۆ ئەمە وترابێت ڕاستە.

با دووباره بگەڕێینەوە سەر ژیانی دواناوەندیم...

ژیانی دواناوەندیم... ئەو بەشەی ژیانم کە هەرگیز نامەوێت گەر بۆ ساتێکیش بێت بیرم بکەوێتەوە، چونکە پڕ ئێش و ژانترین ساتەکانی ژیانم بوو. ئەو کەسایەتییە پاك و بەرزەی کە لەدایکمەوە بۆم مابویەوە لەو ساڵانەدا لەلایەن هەموو ئەو کەسە بەدڕەفتارانەوە شێوێنرا و کەسایەتیم بەباچوو. ئاخ...ئاخ... چی دەبوو گەر ئەو ساڵانە نەژیامایە ! ! !

لە نێوەندی جۆش و خرۆشی ئارەزووەکانی لاوێتیدا بووم...خۆتان دەزانن ئەم تەمەنە تەمەنی بێ ئاگایی و بیرکردنەوەیە لە هەر شتێك بە جۆرێکی زۆر جیاواز. لەم تەمەنەدا هەموو شتێکت دەوێت، هەموو شتێك جوان دەبینرێت. هەر شتێك دەکەیت زۆر بە گوڕوتین و شەوق و زەوقەوە دەیکەیت. حەقیقەت ڕەنگی ئەندێشە دەگرێت و عاتیفەش لۆژیك دەکاتە دیلی خۆی. لەم تەمەنەدا دەکەویتە ناو خۆشەویستی درۆینەوە و سەرابەکانت لێ دەبێت بە مێرگ. لە گەڵ گەنجانی بەدڕەفتاردا دەگوزەرێنیت و کۆمەڵێکیش لە پەنادا مشتیان لێ خۆش کردویت و ....

هەموو هاوڕێکانم لە کەیفی خۆیاندا دەژیان، کراسیان، مۆدێلی قژ، هەمەچەشنە بۆنی خۆش، هەموو ئەو جوانکارییانەی کە کچێکی گەنج هەیبوو ...بەڵام من لە دەرەوەی کۆمەڵگە و هاوڕێیانمەوە و بێ بەش لە هەموو ئەو خۆشییانە بە تەنیایی دەمگوزەراند...

لەگەڵ کێدا بدوێم؟ خۆ هیچ خاڵێکی هاوبەشمان نییە باسی بکەم؟... باسی ئەو خەرجییەی باوکم بکەم کە پێی دەدام، یا لەو میوانانەی کە دوێنێ هاتنە ماڵمان بدوێم؟ یاخود باسی ئەو گەشتەمان بکەم کە لەگەڵ ماڵەوە بە ئۆتۆمبێلەکەمانەوە کردمان بە ناو شاردا؟

ناچمە ناو ئەو بابەتانەوە چونکە هیچی نەبوو بە نسیبم و نەمتوانی وەکو ئەو ژیانە بژیم، تەنها هاوڕێیەکم هەبوو کە ناوی (ئەمینە)بوو. زۆر جار ئەوەی لە ناخمدا هەبوو بۆم باس دەکرد، باوکی مامۆستای سەرەتایی بوو. کچێکی زۆر سەنگین و ڕەفتار شیرین بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆر زیرەك بوو. ئەمینە زۆر زوو لە شتەکان تێدەگەیشت و دەرکی پێ دەکرد، سەرەڕای ئەوەی پەروەردەیەکی زۆر جوانی لە خێزانەکەیەوە وەرگرتبوو. هەندێك لە کاڵ فامەکانی هاوڕێمان مامەڵە و هەڵسوکەوتە نموونەییەکانی ئەمینەیان پێ هەرس نەدەکرا و تانەیان لێدەدا و پێیان دەوت: (کۆنەپەرست، دواکەوتوو، و لەم قسانە..).

ئاه... خۆزگایە منیش وەك ئەمینە (کۆنەپەرست) بوومایە! بەلام پاکیزەیی و کەسایەتیم لەدەست نەدایە...

من جگە لە چاکە و دڵسۆزی چی ترم لە ئەمینە نەدی و هیچ بەرهەڵستییەکی نوێ خوازیی نەدەکرد. هەوڵی زۆری لەگەڵم دا تا منیش وەك خۆی ئاکار سەنگین و جوان هەڵوێست و ورە بەرزبم، کتێبی زۆری پێدام. بەلام تەنها لەبەر ئەوەی زویر نەبێت وەرم دەگرت ئەگینا هیچم نەدەخوێندەوە، هەر بۆیە دەتوانم ساڵانی خوێندنی ئامادەییم بە ساڵانی نامۆیی لە ڕۆحانییات ناو بنێم.

ڕۆژێکیان ئەمینە بانگهێشتی کردم بۆ ماڵی خۆیان. دایکی زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم. خوانێکی نایابی بۆ ئامادە کردبووین، ئامۆژگارییەکی زۆری کردین. درێژەی ئامۆژگارییەکانم لەیاد نەماوە، بەلام بیرم دێت کە ڕۆشتم پاکەتێکی خستە دەستمەوە. کاتێك کردمەوە بینیم هەندێ پارە و خاولیەك و جوتێك نەعلی تێدا بوو. زۆر سەرسام بووم نەك بە دیارییەکە یاخود بەو وردییەی دایکی ئەمینە، بەلام بەو ژیانە بەختەوەرەی

خێزانەکەیان و بە بوونە خاوەنی دایکێکی ئاوا و بەو پەیوەندییە گەرم و گوڕە. ئەمانە هەموو ئەو ئومێد و حەسرەت و بیر و خەونانە بوون کە ژیانیان داگیرکردبووم. ئای دایە! ئەگەر دەتزانی چەندە بیرت دەکەم!...

لە زۆر زووەوە ڕوخسارتم نەدیووە،

ئەم بارە من دەکوژێت،

مەپرسە حاڵم لە هاتووان و ڕۆیشتووان،

سیمات دەرخە دایە، بۆ ئەم تاقانەیەت ببە هەتوان...

لە دواناوەندیدا نەمتوانی دەوروبەرێکی باشم هەبێت. هەستم بە بەدنیازی هەندێ لە گەنجەکان کرد. بەڵام بە هۆی تەنیایم و بێ چارەییمەوە وازیان لێ نەدەهێنام. هەندێکیانم زۆر باش دەناسی، ئەوانە تەنها دەیانویست بۆ کات بەسەربردن لەگەڵم بن. منیش زۆرم لە خۆم دەکرد و ڕووم نەدەدانێ. واتە باشەکانیان دەستی من نەدەکەوتن و منیش خراپەکانیانم نەدەویست.

لە خوێندنگە هەندێ گەنجی چەپ هەبوون کە زۆر جار دەچوومە لایان و لە کۆبونەوە و دانیشتەکانیاندا بەشداریم دەکرد. لەبەرئەوەی لە فەلسەفەی تێگەیشتنی ئێمەدا هێزێکی مەعنەوی(واتایی) نەبوو لە ژیاندا تا ملی بۆ دابنەوێنین، بۆیە خۆمان بە ناچار نەدەزانی پابەندی هیچ ڕێسایەك بین. هەڵبەت چەمکی دین لە بەرایی ئەم لیستەدا بوو. بۆیە بە سەربەرزییەوە بەشداری چالاکییەکانیانم دەکرد. لەوە گرنگتر بۆ کچێکی لاوی تەنیای بێچارەی وەك من بە ڕێگای ڕزگاریم دەبینی، بە لایەنی کەمەوە دەمویست وابێ. چونکە هیچ نەبێ گەنجانی ئەوێ منیان وەك مرۆڤێکی ئاسایی دەژمارد و ڕێزیان لێ دەنام، بەڵام بەداخەوە کەوام هەستکردبوو...

ئەو گەنجە بێباکانەی لە چواردەورم بوون هەندێ جار زێدەڕەوییان دەکردو منیش بە گژیاندا دەچووم، گوایا بەم شێوەیە خۆم دەپاراست. وای ئایسێلی داماو وای....بەو دەستە ئاوریشمەوە چۆن شەڕ دەکەیت و پارێزراو دەبیت؟

بمەوێ و نەمەوێ چیتر کەوتبوومە بارودۆخێکی واوە کە خۆشم دەمزانی خۆمم بۆ ناپارێزرێت. منی داماو هەر چوارلام بە دوژمن تەنرابوو....بە جۆرێك کە نەمدەتوانی بزانم کێ دۆست و کێ دوژمنە. یاخود پێوانەکانی من نەیاندەتوانی ئەوە لێك جودا بکەنەوە.

## ژینم سەرەونخوون بوو:

بەردەوامم لە گێڕانەوەی ئەو ژینە ڕیزپەڕەی کە هیچ بەزەییەکی بۆم نەبوو...

بەڵێ، ئیدی ئەو ڕۆژانەی بۆ من ناخۆشترین و تاڵترین تراژیدیایان بەخشی نزیك دەبوونەوە. هیچ کات بیرم لەوە نەکردبوویەوە ژیانم بەو ڕادەیە دابڕمێت و ئومێدەکانم لە ڕەگەوە هەڵبکێشرێن، بەڵام ئەو دۆخەی بەبێ پەروا و بێ بیرکردنەوە تێی کەوتبووم هەر زوو هەواڵی ئەوەی دابوو، بەڵام تاوانەکانی لاویتیم ڕێگەیان نەدام دەرك بەو بارە بکەم، گەر ئەو تاوانانە نەبوایە ئەوا ئێستە لێرە نا، بەڵکو لە شوێنێکی تر دەبووم.

ئەو ڕووداوە هەژێنە.. هەرکات چمکێکیم بیر دێتەوە، زیاد لە خودی ڕووداوەکە، پێشەکییە ئامادەکراوەکانی، مووەکانم گرژ دەکەن و هەستی نەفرین لەخۆکردنم تێدا دەبزوێن.

سەرلەنوێ سارای ئەندێشە لە خۆیدا ونی کردمەوە ...

ئەوە پشکۆی پەشیمانییەکی بێ هودە بوو و هەناومی دەقرچاند.. هیچ کەس ئاگای لێ نەبوو. بەڵام بە چی دەچێت؟! کوڕە دەوڵەمەندێکی بەناو

بانگ کە هیچ باکێکی بە دونیا نییە.. لافی ڕاستگۆیی لێدەدا، ڕاستتر بڵێین وەستایەکی شارەزاو ڕێوییەکی فێڵباز بوو. منیش کچێکی لاوی ساویلکە. ئەم فیلمە هەر لە سەرەتاوە دیار بوو کە بە فرمێسك کۆتایی دێت.

بەڵام وەرە ئەم مێشکە پووچەی من حاڵی بکە. بەهۆی ئەوەی کە بەهرەیەکم هەبوو لە وێنەکێشاندا، بەشداریم کرد لەو دەستەیەی کە مامۆستای هونەرمان پێکی هێنابوو. پێشەنگی دەستەکەش کوڕی سیاسەتمەدار و بازرگانێکی ناسراوی ئەو دەڤەرە بوو کە ناوی (چاداش)بوو. چاداش خوێندکارێکی دیار بوو لە خوێندنگەکەماندا. هەرجۆرە چالاکییەك بکرایە دەبوو بە بەشداربوون یاخود بە ڕێکخستنی ئەو چالاکییە ڕۆڵێکی بگێڕایە.

بە پشت بەستن بە دەوڵەمەندییەکەی باوکی، مامۆستاکانیش زۆربەی چالاکییەکانیان بەو ڕادەپەڕاند، ئەویش نامەردانە ئەمەی کردبووە هەل و دەرفەتێك بۆ قۆستنەوەی متمانە و خۆش باوەڕیی کچەکان. سەرەڕای هەموو ئەمانە لەگەڵ (چاداش)دا ئاشنا ببووم و تەواو شەیدای یەك ببوین و لێك جیا نەدەبووینەوە.

ئەمینەش زۆر ژیر و تێگەیشتوو بوو، زۆرجار ئاگاداری دەکردمەوە: "ئەو کوڕە کەسێکی بێ باکە، ئاگاداری هەڵسوکەوتت بە". هەر کەس گەورەیەك یان ڕێ نیشاندەرێکی نەبێت سەری بە هەموو گۆشەیەکدا دەکات. وەك ئاشکرایە مرۆڤ لەو تەمەنەدا خۆی بەخاوەنی بۆچوون دەزانێت و چاوی لەئاست ڕێنمایی کەسانی تردا هەڵنایەت.

مەخابن واش بوو.

بەهۆی ئەوەی بەهرەیەکی وێنەکێشانم هەبوو هەر کات قەڵەم و کاغەزم بەدەستەوە دەگرت دەبوو وێنەیەکم بکێشایە، جا یا بینا و خانوو یان وێنەی هەموو ئەندامانی خێزانەکەم (کە نەم بوو).

زۆر جارانیش خۆم بە خوێندنەوەی شیعرەوە سەرقاڵ دەکرد، بەتایبەتی خوێندنەوەی ئەو شیعرانەی بۆ دایك نوسرابوون. پەیوەندی و نزیك بوونەوەم لە چاداش ڕۆژ دوای ڕۆژ لە هەڵکشاندا بوو، بە وێنەی دوو هاوڕێی سەر ڕاست و دڵسۆز پلانی گەشمان دەکێشا و زەمینەی فشەڵی داهاتوویەکی ساختەمان تاوتوێ دەکرد. ئەمە لەو ژیانە وێرانەیەمدا شتێکی هەر زۆر ئاسایی بوو. زیاد لەمە ئەوەشی پێ ڕاگەیاندبووم کە بە کۆتایی هاتنی وەرزی خوێندنمان دەم کاتە بوکێکی شۆخی خانەوادە بەناوبانگەکەیان.

بەڵام... بەڵام سەرەنجام چاوەکان کوێربن و هەنگاوەکانیش بەرێی خۆیان نەبینن! ئەمینە هەر زوو پێشبینی ئەم دەرەنجامەی کردبوو، هەر بۆیە زۆر هەوڵیدا تا منێکی هەتیوی بێکەس زیاتر ژیانم بەرەو فەوتان نەچێت. بە هەموو هێزیەوە ڕێگری دەکردم، نموونەگەلێکی زۆری بۆ باس دەکردم تا پەند وەربگرم و چەند بارە نەکەومە ناو هەمان هەڵەوە. زیاد لەگوێ نەگرتنیش لێی، جارێکیان پرکێشیم کرد و هاوارم بەسەریدا کرد: "هەرلەبەر ئەوەی خۆت کەسێکی وات دەست نەکەوتووە ئیرەیی بەمن دەبەیت"..!!

جا ئەو ڕۆژە ڕەشە و کابوسی تارماییەکانی... چاداش ڕۆژێکی شەممە بانگهێشتی ماڵی خۆیانی کردم.. بەهانەش بۆ ئەمە: "گروپێك کچی تر دێن بۆ ماڵمان سەیری ئەو وێنە و تابلۆیانە دەکەن کە کێشاومە. هەر بەو بۆنەیەشەوە سەرو پەرداخ چا دەخۆینەوە" منیش بێ بیرکردنەوە

قەبولّم کرد. "گەورەکانمان جوانیان فەرمووە کە باروت و ئاگر پێکەوە هەڵناکەن. مەگەر چەندە ڕاستە کە کوڕ و کچێك پێکەوە بن سێهەمیان شەیتانە!"

چیتری ئەو یادگارییە تاڵە باس بکەم؟! بە خیانەت کردن لە خۆم و دایکی ئازیزم، ئەو دایکەی وانەی دین و ژین و ئیمانی بە خەڵکی دەوت لەو ماڵە هاتمە دەر. ئەو ناپاکییە ئەوەندە گەورە بوو کە لێخۆشبوونی نییە!.. سەرەنجام وەك پێشبینیتان کردبوو بەزۆر لەقەفەسی دەستدرێژیدا توندی کردم. منی ساویلکە بوومە کۆیلەی ئارەزووە ئاژەڵییەکانی دڕندەیەك و بەچڕنووکە ژەهراوییەکانی پاکیزەیی لێداماڵیم. ئەم ڕووداوە بەتەواوی مانای تیاچوونی من بوو. بۆ یەکەمجار سەدای پووکانەوەی هەموو ئەو هیواو ئامانج و ئاواتانەی کە دامنابوون بەر گوێم کەوت، هەموو ئەو شۆك و بارە ناچیز و ڕووداوە لەرزێنەرانە دێوەزمەیەکیان بۆدروست کردم و بووە لەکەی شەرمەزاری بە تەوێڵی کەسایەتیمەوە، ویست و حەزی ژیانمی سەرەونخون کرد، کۆشکی کەسایەتی مرۆڤێك ڕووخێنرا، پاکیزەیەك لە ژێر پێ نرا، مەگەر ئەوانە هیچ بەها و سەنگێکیان بۆ مرۆڤ دانەدەنا، مەگەر ئێمەی کچان جگە لە پارچە گۆشتێك بۆتێرکردنی ئارەزووە نزمەکانی ئەوان چیدی نەبووین.

فەریاد و هاوارم لەماڵەکەدا هەموو خەڵکی باڵەخانەکەی هێنابوویە سەرپێ! بەکێ چی؟ ئەوەی پلانی ئەو تەڵە بەناپاکی چنراوەی دانابوو کاری سەرەتایی بۆ ئەوەش کردبوو. مەگەر چی کە هەموو هات و هاوارم تەنها خۆم بیستبووم!..

ئەو ڕۆحە پاکەم، سەرتاپای جوانییەکانم، هەموو ئەو بیرە ناسکانەی بۆ داهاتوو هەم بوون، هەموویم لەو ماڵەدا بەجێهێشت..

چیتر من نەدەژیام، وەکو مردوویەکی زیندووم لێهاتبوو، دەبێت هۆشم لەدەست دابوویێت کە خیانەتم لەو ئەمانەتەی دایك و باوك و برا ئازیزەکەم کرد!.

## هەوڵی خۆکوشتنیشم سەری نەگرت:

بیرکردنەوەم لە کار کەوت، ئیتر بەردێك بووم، جەستەیەکی بێ ڕۆح.

تا هاتمەوە بەشی ناوخۆیی سێ جار هەوڵی خۆ کوشتنم دا .. سێ جار خۆم هاویشتە بەردەم تایەی سەیارەوە، چەندە ناڕەحەت بوو ئەو مردنە! دەمەوێ بمرم قەدەر ڕێگەی خۆ کوشتنیشم نادات! چیتر ناتوانم بژیم. ئۆتۆمبێلەکانیش نام شێلن، دەڵێی شۆفێرییان تەنها بۆ منە! ڕۆژانە چەندەها ڕووداوی ترافیك دەبێت، چەندەها کەس دەمرێت، لەکوێن؟

ئەی بۆ من نامرم؟ .. نازانم هەردەڵێی هێزێکی شاراوە ڕێگرە لە مردنم.

هاتمەوە بۆ بەشی ناوخۆیی، زۆر شەکەت بووم، چەند ڕۆژ بەبێ خواردن و خواردنەوە ژیانم بەسەر برد، زیاد لەوەش نەدەچووم بۆ خوێندنگە، تەواو ڕووخا بووم...

تەنها دۆستم، هاوپۆلم، ئەمینە چەند جار هاتە لام. زۆر تکای تیادەکردم کە لە خوێندن دانەبڕێم تەنانەت جارێکیان دایکیشی لەگەڵ خۆی هێنابوو.

بەڵام من هیچ گوێم نەدانێ چونکە بەلای منەوە هەموو شتێك بەپایان گەیشتبوو...

تەنها ڕێگە چارەشم شاردنەوەی ئەو جەستە گوناهکارەم بوو لە پەنای مەزارگەیەکدا. چونکە هەروەك لە ژیاندا بەتەنها بووم با لە مردنیشدا دوور لە دۆست و هاورێ و خزمان و نزیکانم بم..

نەمتوانی بەرهەڵستی پێداگرییەکانی ئەمینە بکەم و بەسەرهاتەکەی لێ بشارمەوە. کە شەرمەزارییەکەم بۆ گێڕایەوە هەروەك ئەوەی ڕووداوەکەی پێشتر بینیبێت، زۆر بەلایەوە مایەی سەرسامی نەبوو، چونکە زۆر جار هۆشیاری دەدامێ کە لەگەڵ هەموو کەس بەیەك جۆر ڕەفتار نەکەم.. نازانم بۆچی تێنەدەگەیشتم و گوێم بۆ نەدەگرت..!

تەزووی نەفرین و قێزلەخۆکردنەوە جەستەی ئەتك کراومی هێنابووە لەرزە. بە هیوای چارەیەك بۆ ئەم دەردە بێ چارەیە خۆم لای باوکی چاداش بینییەوە، بڕیارمدا خیانەتەی کوڕەکەی بۆ باس بکەم (بەڵکو سۆزی بۆم بجوڵێ و بەزەییەکی پێمدا بێتەوە و لەم بێ دەرەتانییە ڕزگارم بکات).

هەموو ئەو پلان و ڕووداوە قێزەونەم بەدەم فرمێسکەوە بۆ باس کرد، بەڵام سەد داخ، بە بێ هیچ شەرمکردنێك، سەرەڕای ئەوەش کە وەك ڕووداوێکی زۆر ئاسایی دەهاتە پێش چاوی بەرەو ڕووم وتی: من کاتی ئەوەم نیە لەگەڵ کەسێکی سۆزانی وەك تۆدا بەفیڕۆی بدەم، بڕۆ سەیری بەرپێی خۆت کردبا و ئاگات لە هەڵسوکەوتت بوایە..!

ئەم هەڵوێستە نامرۆڤانەیە هێندەی تر زامەکەی کولاندمەوە. هەر بەوەوە نەوەستا، هەروەك بڵێی شایستەی زیاترم، هەستایە سەرپێ و بەدەنگێکی بەرز بە ڕوومدا: بڕۆ دەرێ و لەبەر چاوم ون بە، گەر نا هەر ئێستا پۆلیس بانگ دەکەم تا بۆ هەتا هەتایە بتکەنە زیندانەوە.

فرێی دامە دەرەوە، هاوشێوەی زبڵ لە سەر ئەو شۆستانە کەوتم.

تەنها شتێك لەو کاتەدا بە بیرمدا دەهات مردن بوو، بەڵێ ئەو، واتە مردن تاکە دەرگایەك بوو کە دەیتوانی خۆیم بۆ بخاتە سەر پشت و بمگوازێتەوە بۆ وڵاتی (نادیار). جار جارەش سێبەری وتەکانی ئەمینە

دەکەوتە سەر یادگەم و ڕاست وێژی ئەو و سەرکەشی منی دەهێنایە پێش چاوم.

زۆرجار دەیوت: ئایسێل هەر کەس یادی خوا لە دڵیدا نەبێت و لە تاو لەدەست دانی خۆشەویستی ئەو خۆشویستراوە ئەزەلی‌یە ڕانەچڵەکێت، دەستی دەچێتە هەموو کارێکی بەد و نەشیاوەوە. مەگەر چەندە ڕاستگۆ بوویت.. !

باوەڕ دەکەیت یان نا ! تاکە بەربەست لە ئەنجامدانی ئاوها کارێك بریتی‌یە لە پشکووتنی گوڵی خۆشەویستی پەروەردگار و ترسی ڕەنجانی ئەو خۆشەویستە لە دڵاندا. گەر نا خۆڕاگرتن لە بەردەم شاڵاوی سەختی نەفس و هەڵچوونی ئارەزووە ئاژەڵی‌یەکانی جەستە کارێکی ئاسانە.

دووبارە دەستم کردەوە بە لادان، هەندێ جار وام لێدێت ئازارەکانم دەمبەنەوە چەند ساڵی ڕابوردوو و بەرەو ئەو نشوستی و مەینەتییانە ڕاپێچم دەکەن.

ئەو کارەساتەی چاداش بەسەری هێنام هیچ چارەیەکی بۆ نەهێشتبوومەوە جگە لە پەنا گرتن بە پەروەردگار.

هاوارم دەکرد! خودایە یارمەتیم بدە.. گەر لەڕێش لام دابێت بەڵام خۆ دوا پەناگەم تەنها و تەنها تۆیت. توانای خۆت پیشانی ئەو خائینانە بدە.. ئەم بەندە لاوازەشت لە تەنگانەدایە، خودایە چی دەبێت یارمەتیم بدە.

ئەو پاڕانەوەیە چەندە بارێکی نامۆ بوو! هەروەك دەما و دەم ئەو نزا و پارانەوەیەم گیرا بووبێت و لە ئاسمانەوە ڕاستەوخۆ وەڵامی نزاکانی من درابێتەوە، پاش ئەوە ڕووداوێك ڕوویدا کە بە بۆچوونی ئەمینە (دەستی یارمەتی خودایە).

لە بیری ئەوەدابووم پێش ئەوەی بمرم پلانی لەناوبردنی چاداش دابنێم و گورزی تۆڵەی خۆم بوەشێنم. لەم سەروبەندەدا ئەمینە بە هەناسە بڕکێوە خۆی کرد بە ژوورەکەمدا...

## سەرەنجامی ناپاکی

لە ئامێزی گرتم و بە هەناسەی پچڕ پچڕەوە وتی:

– نزاکانت لای یەزدان گیرابوون..

بە مەراقەوە پرسیم:

– چی بووە؟!..

– چاداش مردووە.!

هەر کە وشەی مردنم بیست خێرا هەستامەوە و ئامێزم بۆ ئەمینە کردەوە. وتم:

– ڕاستیم پێ بڵێ، چیتر بەرگەی هەڵخەڵەتاندن و گاڵتە ناگرم!

– ڕاستی دەڵێم، مردووە و دەڵێن لەماڵەکەی خۆیاندا خواردنی ژەهراوی بووی خواردووە. بەڵام بە دروستی هۆکاری سەرەکی نازانرێت.

لەوکاتەدا بۆ یەکەمجار ئەمەم بەدڵدا هات: (خودایە...! ئەی دروستکەر و سەرپەرشتیکەری کاروبارەکانی گەردوون، بەراستی مەزنیت، دەسەڵات و توانات بەسەر هەموو شتێکی گەردووندا هەیە). لەو دەمەدا لە قوڵاییەکانی ناخمەوە ئارەزووم دەکرد ڕابکەم و ئەمە بە گوێی هەموو دروستکراوێکدا بدەم.

چەند بێ باوەڕبیت بەڵام لە کاتی تەنگانە و بێ نەواییدا خودات بەبیر دێتەوە.."ماددە" تاکە دەروازەیەك بوو کە لێیەوە دەمڕوانییە بوون. تاکە زاراوە بوو کە زمانی ئاوەزم گۆی دەکرد. جێگایەکی تر بۆ ئەمانە نەمابوویەوە. بەڵام ئەو بەسەرهاتە ڕاستییەك بوو کە بەتەواوی مانا گومان

بڕ بوو. بە جۆرێك نەمدەتوانی خۆم لە نیگا ڕاشكاوەكانی ئەم ڕووداوە ڕاز ئامێزانە دەرباز بكەم..!

بێگومان فەرمانڕەوای گەردوون لە ستەمێكی ئاوها خۆش نەدەبوو. مردنی چاداش هەرچەندە چارەیەك نەبوو بۆ ئەو ژیانە دۆزەخییەی كە تیایدا دەژیام، بەڵام هیچ نەبێت لەژیاندا نەمانی دڵدانەوەیەكی بچووك بوو بۆم...

یەكسەر لە شوێنی خۆمدا دانیشتم و هۆن هۆن دەستم كرد بە گریان، ئەمە ئەشكی حەز و كین و تۆڵەیەكی نوێ بوو پێكەوە. دەبوو لەگەڵ ئەمە ڕابهاتبام، چونكە گەر چیتر بژیامایە بەم جۆرە بوو ژینم. ئەوەی چووبوو چیتر ناگەڕێتەوە، ئەو ئومێدە ڕووخاوانە چیتر ئەستەم بوو بیناكردنەوەیان و، هەموو هەستە مردووەكانم زیندووبوونەوەیان زەحمەت بوو..

بەهۆی داكۆكی زۆر و پشتگیری ئەمینە و ماڵەوەیان جارێكی تر گەڕامەوە خوێندنگا. ئەو ڕۆژە تەرمەكەیان هێنابووە خوێندنگا و بۆنەیەكی ماتەمیان بۆ ڕێكخستبوو. هیچ كەس لەو ڕیزپەڕی و كارە بەد و سەركەشییانەی كە ئەنجامیدابوون بەئاگا نەبوو، هەركەس دەچووە سەر سەكۆ باسی لە لێهاتوویی و بلیمەتی و بەتوانایی و قارەمانێتی ئەو وەكو قوتابییەكی نموونەیی دەكرد. چەند جار هاوارم كرد: تكایە كەمێكیش گوێ لەمن بگرن تا باسی ئەو دڕندەیەی ناو پێستی ئادەمیتان بۆ بكەم، كە چۆن خوێنی ستەم لێكراوێكی وەكو منی مژی، بەڵام ئەمینە بەهیچ جۆرێك دەستی بەرنەدام، چونكە دەیزانی كارێكی چەندە شێتانە دەكەم!..

هەرکەس هەڵدەستا لە سەنا و ستایشکردنی نەدەکەوت، هەتا هەندێکیشیان فرمێسك بە چاوانیاندا دەهاتە خوارێ. ئەمینە ئەو ئێوارەیە بردمیەوە بۆ ماڵی خۆیان، لەڕاستیدا نەمدەویست ئەو کەشە پاکەی ناو ئەو خێزانە لەکەدار بکەم. بەڵام ناچاربووم نەمتوانی قسەی ئەمینە بشکێنم، ئەمینەی دۆستی ئازار و خەم و دەردەکانم. ئەمینەی دڵسۆز ئاگای لەو ساردییەم بوو لە ڕووی دینداریيەوە، لەبەرئەوە زۆربەی کات لە گەڵمدا بوو و لێم جیا نەدەبوویەوە و هەندێ جاریش تێکەڵی کەسی دینداری پێدەکردم. لەلای برادەرەکانم ئەوانەی کە وەکو من بیریان دەکردەوە ڕێزێکی ئەو تۆم نەمابوو، نەم دەتوانی وەکو ئەوان شاهانە بژیم. مرۆڤ دەبێت بەڕێزەوە بژی و خاوەن کەسایەتی خۆی بێت، هەروەها من کچ بووم، بمانەوێ و نەمانەوێ ئێمەی کچان لە چەند ڕوویەکەوە جیاوازین لەگەڵ کوڕ، کچێك بۆ ئەوەی ڕێزو سەنگینی و کەسایەتییەکی تایبەتی هەبێت دەبێت دەرك بە کۆمەڵێك هەستیاری بکات. من ئا لێرەدا لەگەڵ هاوشانەکانمدا لێك تێنەدەگەیشتین.

ئەمینەی هاوڕێم لەگەڵ برادەرە هاوبیر و باوەڕەکانیدا نەدەگەڕا، بەڵکو لەگەڵ مندا زۆربەی کاتەکانی بەخەرج دەدا، دەمزانی کە بە باوەڕی خۆی ئەرکێکی پیرۆز ئەنجام دەدا و دەیویست تامی باوەڕو ئیمانی ڕاست و دروستم پێ بچێژێت.

ئاه.. خۆزگایە توانیبای! هەندێ جار زۆر ئەمەم دەویست. بەڵام بونیادی من توانای ئەوبابەتە هەستیارانەیان نەبوو. لەبەرئەوە نەبوو و نەبوو... دووبارە لەبابەتەکە چوومە دەرەوە، داوای لێبووردن دەکەم مامۆستا..

زۆر ماندووبووم.. کەمێك پشـوو دەدەم و دواتـر دەسـت پێدەکەمـەوە. هەڵبەتە گەر تەمەن بوار بدات..

بەتـەنیا و بـێ پشـت و پەنایـەك لەبەرانبـەر کۆسـپ و لەمپـەرەکانی ڕۆژگاردا وەستا بووم.

وەك کچێکی گـەنج نـەم دەتـوانی ڕاسـتییەکان وەکـو خۆیـان ببیـنم، بەهۆی بێ ئەزموونیشمەوە ڕاست و چەپم لێك جوودا نەدەکردەوە، چونکە چواردەورم بەکەسانێکی بێ شەرم و شکۆ دەورە درابوو. بەرگـەگرتن زۆر ئەستەم بوو.

پێش ئەوەی چاوم بە ڕووناکی ژیـان هـەڵبێت تـاریکی ژیـان بەسـەرمدا داهات..!

## دووبارە سڵاو مامۆستا

### لەماڵی ئەمینەداین:

ئەمینـە بـەزۆر بردمیـەوە بـۆ ماڵـەوە و ئەوەشـی وت کـە بەسـەرهاتی چـاداش لای کـەس نادرکێنێـت و نەیدرکانـدووە. بەڵێنەکـەی بردەسـەر. چونکە تا ئێسـتا ئەوبەسـەرهاتە کـەس نەیبیسـتووە، دیـارە کـە بەڕاسـتی کچێکی دروستە، ئەگەر برادەرەکانی خـۆم بوونایـە هـەر لـە یەکـەم سـاتدا دەکەوتە شارانەوە. یەکێك لـەو لایەنانـەی کـەوا ستایشـی ئـەو دیندارانـەم بەهۆیەوە دەکرد ئەم لایەنەیان بوو، هەر هیچ نەبێت ئەو بەڵێنەی دەیـدەن دەیهێننە جێ، ئەی سەبارەت بە ئێمە چی..؟ ئەوە هەر باسی مەکە..

## ئەمینە و باوکی دەیانویست ڕزگارم بکەن

دایك و باوکی ئەمینە زۆر بەگەرمی پێشوازییان لێکـردم، مـاڵێکی پـاك، بۆنی میسك ئاسا.. لە هەمولایەکەوە بەرامەی ئاسوودەیی دەهات. هات و

هاوار، جنێو، سوکایەتی، وتەی ناشیرین، فێڵ کردن، یاخود هەڵە بەرامبەر کردن، هیچ لەمانە بوونی نەبوو..

لەوێدا خۆم لە شوێنێکی هێمن و ئاسوودە بەخشدا دەبینییەوە. دایکی بەنەرم و نیانی و لەسەرخۆییەکەوە لە ئامێزی گرتم و بەخێرهاتنێکی گەرمی کردم.

ئا لەو کاتەدا یادی دایکم کەوتەوە و وتم گەربمایە ئەویش چاوەڕێی هاتنەوەمی دەکرد و لە ئامێزە گەرمەکەی خۆی دەگرتم و خواردنی خۆشی بۆ ئامادە دەکردم..

لە ئامێزیدا هیچ نەنوستووم، ڕوومەتەکانم هیچ بەر لێوە تەڕەکانی نەکەوتووە..ئاه دایە!..

چ دەبوو لەژیاندا بمایتایەو بۆ جارێکیش بتوتایە: "کچم ڕۆڵە شیرینەکەم" دەزانیت دایە چەندە ئاتاج و تینووی دەنگتم؟...با لێرە نەوەستم چونکە بەڕاستی هەر کە بیرم دەکەوێتەوە دووبارە هێزو وزەم لێ دەبڕێت. دایکی ئەمینە خۆشترین خواردنی ئەنادۆڵی بەجوانترین شێوە ئامادەکردبوو بۆمان. هەمیشە و هەردەم ئاوات و هیوام سفرە و خوانێکی بەوشێوەیە بوو کە لەگەڵ هەموو ئەندامانی خێزانەکەماندا پێکەوە کۆمان بکاتەوە و خواردنی لەسەر بخۆین. دایکی بە چواردەورماندا هەڵدەسوڕا و پێداویستییەکانی سەر سفرەکەی تەواو دەکرد، بەردەوام دەیوت: " کچم ئا لەمەش بخۆ یا ئا تۆ بەس تەنها تامی ئەمەشیان بکە، کچم ئەم جۆرەیان زۆر بەلەزەتە. ! " ئای ئەو خاتوونە چەندە دڵپاك و ڕۆح سووك و خۆشەویست بوو، پێدەچێت هەموو دایکان بەو جۆرە بن.

بە ئەمینەم وت:

– دەڵێیت باوکت لەماڵ نیە؟

وتی:

– لەبەر ئێمە نەهات یانی لەبەر ئەوەی خواردنەکەمان بە شێنەیی و لەسەرخۆیی بخۆین ..

چەندە ڕەوشتێکی جوانە ! من بەم ڕەفتارانە هیچ ڕانەهاتبووم. چونکە ئەو ژیانەی کە گوزەراندبووم نەزاکەتی بیر بردبوومەوە.

پاش نان خواردن چووینە هۆڵەکە کە کتێبخانەیەکی گەورەی پڕ لەکتێبی لێبوو، ئەو کتێبانەم هەر نەبینیبوو.. بینایەك لەسەر شێوازی کۆن بنیات نرابوو، دیوارەکانی تابلۆی جۆراوجۆری پێوە هەڵواسرابوون و لە ژێر هەر تابلۆیەکدا وتەیەکی بەپێز و مانادار نوسرابوو.

نووسراوێکیانم تا ئێستاش لەبیرە کە نووسرابوو: "ئەی مرۆڤ خۆت بخوێنەوە"

لە کاتێکدا کە من سەیری لای ڕاست و چەپم دەکرد، باوکی ئەمینە بە ڕوویەکی خۆش و جل و بەرگێکی ڕێکوپێکەوە هاتە ژوورەوە.

کەسێکی زۆر بەڕێز، بەڕوویەکی خۆش و دەنگێکی نەرم و لەسەرخۆوە وتی: "کچی خۆم زۆر بەخێربێیت" بەڵام دەستی درێژ نەکرد بۆ تەوقە، هەر بۆیە منیش دەستم درێژ نەکرد.

تابلێی کاریگەرانەو بە شێوازێکی زۆر جوان و لەسەرخۆ لە باری ژیانمی پرسی، دەمزانی کە دەیویست بمهێنێتە گفت و دڵ ئاسوودەم بکات. گرنگییەکی زۆری پێدام..

وتی: کچم، ئەمینە زۆر دەیویست میوانداریت بکات. منیش زۆرم بەلاوە گرنگ بوو خۆشحاڵ دەبووم.

– من مامۆستام . تۆش بە قوتابیم دەژمێردرێیت. زیاد لەوەش مادام هاوڕێی ئەمینەیت ئەوە هەر بە کچی خۆمت دادەنێم.

منیش هەر وەکو تۆ گەورەبووم، زۆربەی ژیانم بە بۆیاخچێتی و کێك فرۆشتنەوە بەسەر برد، زۆر ئازاری ژیانم چەشت. بەشداریم کردو ئارامم گرت و بەرگەم گرت. خودای گەورە هیچ ئەرکێك بەهەدەر نادات. باوەڕم وایە تۆش ئەم ئازارانە وەلادەنێیت و ژیانێکی کامەران و بەختیارت دەبێت.

## سێ ئامۆژگاری

کچی خۆم لە ئەزموونی ژیان کە بەدەستم هێناوە سێ ئامۆژگاریم بۆت هەیە، گەر بیان هێنیتە جێ باوەڕم وایە سوودمەند دەبیت.

یەکەم: دەمەوێت دەرگاکانی ماڵەکەمت لەمڕۆوە وەکو کچێکی خۆم بەڕوودا بکەمەوە. ئامادەم یارمەتیت بدەم لەهەر کێشەیەك کە ڕووبەڕووت دەبێتەوە. لە ئێستا بەدواوە زوو زوو چاوەڕێتانین. بۆ ئەمە خێزانیشم ئامادەیە. هەر گرفتێکت بۆ پێش هات لای ئێمە باسی بکە، دڵنیابە بەپێی توانامان هەوڵی چارەسەرکردنی دەدەین.

بیرم دەکردەوە چەندە کەسانێکی دڵسۆزو خەمخۆرن! بەڕاستی ئەمانە مانای مرۆڤ بوونیان لە خۆیاندا گەشاندبووەوە.

تەنیا شتێکیان کە ئازاری دەدام پابەندبوونیان بوو بەدینەوە. من لەو شوێنانەدا زۆر بێزار دەبووم، چونکە ئەو شوێنانەی کە من بۆی دەچووم زۆر بەئاسایی جگەرەم دەکێشا، قسەی سەروو گوێ شکاوم زۆر دەکرد، ئاوا خانم ئاسا دانەدەنیشتم، دانیشتنم زۆر تاقیکردەوە بەلام سەری نەگرت..

باوکی ئەمینە بەردەوام بوو لە قسە کردن...

دووەم: کچی خۆم زۆربەی ئەوانەی لە ژیاندا سەرکەوتنی گەورەیان بەدەست هێناوە ئەوانەبوون کە هەژاری و نەبوونی و تەنگژەی ژیانیان زۆر

چەشـتووە، ئەوانـە لەگـەڵ کۆسـپەکانی ژیانـدا بـە جـەنگ هـاتوون و نهێنییەکانی سەرکەوتن شارەزابوون و سەرکەوتوون. بەڵێن بە خۆت بدە و ئامانجێك دیاری بکـە.. بـە بەرنامـە و پـلان هەوڵبـدە، کاتـەکانت بـەوردی هەڵبسەنگێنە، باوەڕم وایـە زۆر سـەرکەوتوو دەبیـت و دەچیتە شـوێنێکی زۆر بـاش. لەهەوڵدانـدا بـە، دەتـوانم یارمـەتیتان بـدەم و جگـە لـەوەش برادەرانت زۆر کاریگەرییان دەبێت لەسەر سەرکەوتنت.

سێیەم: کچی خۆم کەسێك کـە چـاوەڕێی شـتێك لـەژیان بکـات یـاخود بەدوای سـەرکەوتن و دڵخۆشـیدا بگـەڕێت دەبێـت زۆر بـە ئاگـا بێـت و ئـەو ئەرکەی لەسەرشانیەتی بەباشی ئەنجامی بدات.. دەبێت بەدوای مەبەستی بەدیهێنانی خۆیدا بگەڕێت و پێی ئاشـنا بێـت.. گـەر نـا سـەرکەوتن هـیچ سودێکی پێناگەیەنێت و کاتیی دەبێت.

**پێویستە هەموو ڕۆژێك ئەم پرسیارانە لە خۆمان بکەین:**

من کێم؟ بۆچی دەژیم؟ لەکوێوە هـاتووم؟ بۆکـوێ دەڕۆم؟ ئـەو زاتـەی دەسەڵاتی بەسەر ئەم گەردوونەدا هەیە و کاروبارەکانی ڕێکدەخات چی لـە ئێمە دەوێت؟

ئایا ئەو کەسەی کە بـە دوای نهێنییـەکانی گەردوونەوەیـە و لـە هـەوڵی خوێندنەوەی دێڕەکـانی ئـەو پەڕاوەدایـە، چـەندە شـارەزایی نهێنییـەکانی خۆیەتی؟! ئەو مرۆڤەی بە دوای وردەکارییەکانی ژیان و کەسانی ترەوەیە چەندە ئاگای لە کەموکورتی و وردەکاری و ناتەواوییەکانی خۆی هەیە؟!

**دەکرێت لەم دەلاقەیەوە بڕوانینە بابەتەکە:**

بەیانییەك کە لەخەو هەستاین، خۆمان لەناو دنیایەکی پرلە نهێنیـدا لـە گۆشـەیەکی نەناسـراوی ئـەم گەردوونـەدا و لـەناو چـەندەها دروسـتکراوی

سەیرو سەمەرەدا دیتەوە، ئایا دەتوانین وەکو هەر هیچ نەبوبیێت بەردەوام بین لە ژیان و هۆکاری هەموو ئەمانە نەبنە ماخۆلانی سەرمان؟

بەڵێ، کتومت هاوشێوەی نموونەکە، هەر کە چاومان کردەوە خۆمان لەناو جیهانێکی نوێدا بینییەوە، هەر گۆشەیەکی بە دیاردەی سەیر و سەمەرە دەورە دراوە، ئەمە دنیای خەونەکانە! لە هیچ هەسارەیەکی تردا دیمەنی خۆر هەڵهاتن و ئاوابوون ئەوەندە دڵڕفێن نییە، لە هەر چرکەیەکدا چەندەها تۆن ئاو بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە و دواتر بەشێوازێکی زۆر ڕێکخراو دێتە خوارەوە، لەئاسماندا چەندەها گیاندار لەشەقەی باڵ دەدەن و، یەك لەیەك شیرینتر و جوانترن. چەندەها جۆر ئاوازی سەیر سەیر دەچڕن. سەرتاپای جوانییەکان لێرەدان، شاخەکان، دەریاکان، بیابانەکان، دۆڵ و هێلانەکان و ...

ئەمە جگە لەدنیای دەنگ و بۆن کە بۆ خۆیان دنیایەکی تەواو جیاوازن. چواردەورمان بە ملیۆنەها زیندەوەر دەورە دراوە..

بەبێ ویست (ئیختیار)ی خۆمان هاتینە ئەم جیهانە واتا هێنراین، و ڕۆژێك لە ڕۆژان چاومان لێرەدا کرایەوە...

دواتریش ڕۆژێك بەبێ ویست (ئیختیار)ی خۆمان دەبێت ئەم جیهانی خەونە بەجێ بهێڵین...

بەڵێ نهێنییەکانی ئەم جیهانە و بوونەوەر چین؟ چۆن پەیدابوون؟ بۆچی هەن؟ پێدەچێت ڕۆژانە بە تاسەوە بە دووی وەڵامی ئەم پرسیارانەوە بیت، بەڵام ئایا هیچ پرسیارت لەخۆت کردووە کە من کێم؟ بۆچی هەم؟ لەکوێوە هاتووم؟بۆ کوێ دەڕۆم؟ هۆکاری بوونی من چییە؟...

ئایا نابێت مرۆڤ سەرەتا ئاشنای خۆی بێت؟ سەرەتا پرسیار لەخۆی بکات و وەڵام بۆ پرسیارە نەزانراوەکانی بدۆزێتەوە؟ مەگەر ئەمە لە مەرجە سەرەتاییەکانی مرۆڤ بوون نیە؟

کەسێك کە نەزانێت کێیە و خۆی نەناسێت چۆن دڵخۆش دەبێت و دەگاتە ئاسوودەیی؟...

مامۆستا بە باوەڕی خۆی باسێکی زۆر گرنگی بۆ دەکردم، بەڵام بۆ کێ! بۆ منێك کە مێشکی ئەوەم نەبوو هەڵیان سەنگێنم و شییان بکەمەوە و وەریان بگرم، چونکە بەڕاستی باری دەروونیم پەشۆکابوو.

ئەم بابەتانە کاریگەری ڕاستەقینەی نەبوو، چونکە گەر خۆشترین خواردن پێشکەشی نەخۆش بکرێت، ئایا دەتوانێت چێژی ئەو خواردنە بکات؟ ئەو بابەتانەش بۆمن بەوێنەی ئەو خواردنە بوون. دەمزانی مامۆستا مەبەستی چیە، دەیویست چیم پێ بڵێت: "بەندەیەکی گوێ ڕایەڵ بە، ئەوەی پەروەردگار لێتی دەوێت ئەنجامی بدە، گەرنا بەختەوەر و ئاسوودە ناژیت".

بەڵام من بۆچوونی جیاوازم هەبوو لەسەر ئەم بابەتە. چونکە هەربابەتێك لەگەڵ بۆچووونمدا یەکی نەگرتایە، خانم خانم دانەدەنیشتم گوێی بۆ ڕادێرم.

بەڵکو بەپێی بۆچوونی خۆم قسەم لەسەر دەکرد. ئێستاش قسەم هەبوو، بەڵام نەرم و نیانی مامۆستا لە دەربڕینیدا وای لێکردم بەجۆرێك بیربکەمەوە بڵێم تۆ بڵێی دەربڕینی ڕایەکی جیاواز لەڕوویدا شیاوبێت؟!...

بەڵێ بۆ یەکەمجار ئەوەی لە ناخمدا بوو نەموت، بۆ یەکەمجاریش پەشیمان نەبووم لەوەی کە هەڵنەستام بەم کارە.

مامۆستا ڕووناکبیرێکی بەتوانا و لێهاتوو بوو، خۆزگە هەر چیم هەبوو لەوکاتەدا لە مامۆستام بپرسیایە و ئەویش بە بۆچوونی خۆی یەك یەك دەربارەیان ڕوونکردنەوەی دەدا.. زۆر دڵگران بووم بەدرێژ بوونەوەی وتەکانی مامۆستا. هەرچەندە مامۆستا شتی زۆر دروستی باس دەکرد، بەڵام ئەمانە هیچی کاریگەری لەسەرم دروست نەکرد، دەروونی بیمارم هێندە ئامادەگی تێدا نەبوو کە بەم وتانە سەرلەنوێ ئاوێکی زیندەگی بنۆشێت و زیندوو و ڕووناك بێتەوە.

کەسێك لە ئازار و ناهەمواریدا بێت، ناتوانێت بەئاسانی دەروونی پاك بکاتەوە و سوپاسی کەسانی تر بکات. بێزار بووم..

باوکی ئەمینە هەر کە هەستی بەبێزار بوونم کرد، مۆڵەتی خواست و چووە ژوورەکەی خۆیەوە و ئێمەی بەتەنها جێهێشت.

هەموو ناخۆشییەکانی ژیان، ئەو ئازارانەی گریان تێبەردابووم و ئەو ڕووداوە هەژێنەرانەی کە بێ ئاگایان دەخستم، بەردەوام دەبوونە ئاستەنگ لەبەردەم چێژ بینینم لە ژیان. تەنانەت ئەو کەسە فریشتە ئاسایانەش بە کۆڵێك ناسکییانەوە ئازاریان دەدام. لە سەردەمی دواناوەندیمدا کەسێکی تر کە زۆر هانی دەدام و دەستی دەگرتم بۆ سەرکەوتن، مامۆستای وانەی ماتماتیکم مامۆستا بیلال بوو.

زۆر گرنگی پێدەدام، ئەوەبوو جارێکیان لەگەڵ هاوسەرەکەیدا پێکەوە هاتن بۆلام و سەرتاپا پۆشتەیان کردم. هاوسەری بەڕێزی پێدەچوو کەنارگیریمی لە دین زانیبێت، چونکە کتێبێکی بەناوی "ئەو پیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت" پێشکەش کردم. پێشی وتم بیخوێنەوە دڵنیام زۆر لێی سوودمەند دەبیت. لەم کتێبەدا چەمکی پەروەردگار و دوارۆژ و

چەند بابەتگەلێکی تر بەشێوازێکی زۆر زانستیانە باس و ڕاڤە کراون، بیخوێنەوە تا گومانەکانی ناو ناخت بڕەوێنەوە.

کەمێك پەڕەکانیم بەیەکدادا و دواتر لەسوچێکدا فڕێمدا و وتم خوێندنەوەی ئەم بابەتانە کاری کەسانێکی سادەی وەکو من نیە !..

مامۆستا بیلال بەدرێژایی وەرزێك وانەی ماتماتیکی پێ وتم و زۆر زانیاریم لێیەوە پێگەیشت، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام هانیدەدام بۆ سەرکەوتن.

چیتر منیش گەیشتبوومە ئەو باوەڕەی کە سەرکەوتن تەنها گەرەنتیمە بۆ تۆڵەکردنەوە لەهەموو ئەو کەسانەی ڕۆژێك لەڕۆژان بەشداربوون لە کەوتنمە ناو ئەم گێژاوەوە. بەرەو پێشچوونێکی زۆر خێرام بەخۆوە بینی، بەیارمەتی باوکی ئەمینەش بەرنامەیەکی تۆکمەم دانا و خۆم پابەندی هەوڵی ڕۆژانە کرد، بەمە لەماوەیەکی زۆر کەمدا ئاسۆی سەرکەوتنم بەدیکرد و مامۆستاکانیشم شایەتی ئەم حاڵەتە بوون.

ساڵی سێیەم بۆ خۆی تەمەنێك بوو، لەبەشی ناوخۆیی بەڕێوەبەرەکەمان و لە خوێندنگەش مامۆستایان لەبەرئەوەی چاوەڕێی نمرەی بەرزیان لێدەکردم، زوو زوو هانیان دەدام و یارمەتییان دەدام. ئەگەر زانکۆم بەدەست نەهێنایە ئەوا لە بەشی ناوخۆیی دەکرامە دەرەوە، ئەوە بۆ من خۆش نەبوو، بەڵام هەر هیچ نەبێت باشتر بوو لە مانەوە لەسەر شەقامەکان.

تەنانەت ئەم بڕیارەم بەخۆم دابوو: یا دەبێت زانکۆ بەدەست بهێنم یان قەبووڵی هەرجۆرە کارێکی ناڕەوا بکەم کە لەلایەنی کەسانی نەشیاوەوە بەرەو ڕووم دەبێتەوە. جەخت کردنەوەی زۆرم لەسەر بەدەستهێنانی زانکۆ هاوڕێیانم و هەندێ لە مامۆستایانمی هێنابوویە پێکەنین.

بێگومان ڕۆژێك دێت دەیبینن...

بۆ ئەمە زۆر سوپاسی هەموو ئەوانە دەکەم کە یارمەتیدەرم بوون، هەر لە مامۆستا بیلال و خێزانەکەیەوە تا ئەمینە و باوکی بەڕێزی، کەوا ڕێگە نەما نەیگرنەبەر بۆ یارمەتیدانم...

زۆر ماندوو بووم لەنووسینی مامۆستا، پاش کەمێك لە پشوو گەر تەمەن و نەخۆشی ڕێگەیاندام دێمەوە خزمەتتان...

## یەکەمی دواناوەندییەکەمان بووم

سەرەنجام بەهەر جۆرێك بێت دواناوەندیم تەواو کرد، بەڵام بە چ ماندووبوون و لە خۆ بڕانێك! بە نێو ڕەوشێکی ناهەمواردا گوزەرم دەکرد. ئەم جارەیان بەجۆرێك لەگەڵیاندا چوومە جەنگەوە کە تێبگەن چیتر پاروویەکی ئاسان نیم. لەو ماوەیەدا دوورکەوتمەوە لەهەندێ چالاکی کە پێشتر بەشداربووم تیایدا و ڕووبەڕووی ژیان وەستامەوە و وتم: "ئەو شتەی ئاوەز قوبوڵی نەکات باوەڕی پێناکەم"..

سووربووم لەسەر ئەو بڕیارەی کە دابووم، هەموو ئەمانە لەپای بەدەست هێنانی سەرنجی دەوروبەر و سەلماندنی ئەوەی کە: (منیش هەم).

دوای تەواو بوونی خوێندنی ئەو ساڵەم لەگەڵ چەند ڕووداوێکی ڕووخێنەردا چەند هەواڵێکی تری دڵخۆشکەرو وزەبەخشم بیست.

لەکۆتاییدا هەوڵدانەکەم ئەنجامێکی هەبوو و، بوومە یەکەمی خوێندنگە! ئەمە شتێکی باوەڕ پێنەکراو بوو، زۆر سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە یارمەتیدەرم بوون لە هەڵکشاندا بەرەو لوتکە و ترۆپکی سەرکەوتن.

دەبێ لەوە زیاتر چی بڵێم کە قەرزاریانم. هەر لە ئەمینە و باوکی، تا مامۆستای ماتماتیکم و خێزانی بەڕێزی. بەڵام وەرە و تەماشای ئەو کارە سەیرە بکەن، هەموو ئەوانەی کە یارمەتییاندام نەمتوانی بەجۆرێك تەنانەت بیر و باوەڕیشیان وەربگرم، بەڵام هەموو ئەوانەی کە دەیانویست بمکەنە ژێردەستەی خۆیان و بۆ خۆیانم بەکاربهێنن بەردەوام لە خزمەتکردنیاندا بووم!...

مەخابن.. سەرەڕای ئەو ئەزموونە تاڵەم لەگەڵیاندا، هێشتا مێشکی پووچم واز لەو کۆمەڵە برادەرە ناهێنێت کە دین و ژینمیان بە خۆیانەوە لەناوبرد. حەزو هەستەکانم بەردەوام لەلای ئەوانە، بەڵام عەقڵ و هۆشم کەسە دیندارەکانیشی دەویست .. باشە ئەگەر هەموو شتێك بەو جۆرە ڕوون بێت ئەم کێشمە کێشمە لەپای چی..؟

لەوانەیە ویستی سەردانەواندن بۆ فەرمان و یاسا شتێکی تر بێت، دەشزانم کە ئەمە شتێکی دروست و خوازراو نییە، بەڵام ئەوشتانەی مرۆڤی لەسەر ڕاهاتووە وەکو ئەوە نییە بە پێنوسێك بینوسیت و پاشان کە کوژاندتەوە شوێنەواری نەمێنێت...

بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانە نەیویستبوو کە پلەی یەکەمی بە کچێکی وەك من بدات. وتبویان: "ئەو کچە یەکێکە لەوانەی هەمیشە بەشدارە لەتێکدانی کەشی ئارامی خوێندنگاکەماندا و بێ گوێ و یاخییە". بەڵام دووبارە سوپاسی مامۆستای ماتماتیکم دەکەم کە لەوێدا لەبری من قسەی کردبوو و مافی پاراستبووم.

وتبووی: "ماف هی کێیە دەبێت بدرێتە ئەو، ماف ئەمسەرو ئەوسەری نییە!"

دواتر ناچاربوون كه بیدەنە من. سەیری ئەو كارە پێچەوانەیە بكەن! ئەو مامۆستایانەی تا دوێنێ بەدەورمدا دەهاتن، ئەمڕۆ لە بەرئەوەی بچوكترین زیانیان لێنەكەوێت نەیانوێرابوو پشتم بگرن و زیاد لەوەش ئامادەبوون یەكەمی لە كچێكی وەكو من بسەننەوە، بەڵام كەسێك پاڵپشتم بوو بوو كە تا دوێنێ ئەو مامۆستایانە ڕقیان لێی بوو.. لەم كاتانەدا كوڕێك بەناوی "ئیلكار" كە كەسێكی چەپڕەو بوو، وای نیشان دەدا كە دەیەوێت یارمەتیم بدات، زۆر داخوازی ئەوە بوو ببێتە هاوسەرم. منیش زۆر سانا، باوەڕم پێكرد. وتم پێم وانیە ئەمەیان وەك ئەوانیتر بێت، دروستتر و ڕاستڕەوترە. هەر هیچ نەبێ من وام دەبینی. بەڵام لەبەرئەوەی باوەڕم بەكەس نەمابوو، ویستم وازی لێبهێنم لەبەرئەوە چیم بەسەرهاتبوو هەموویم بۆ باسكرد، بەهەرحاڵ هەموو ئەوانەی قبوڵ كرد.

منیش بۆ ئەوەی چیتر ئازارەكانی ژیانم لەسەرم كەم بێتەوە و لەم تەنیاییە ڕزگارم بێت و خێزانێكی كامەران پێكەوە بنێم، ڕەزامەندیم نواند. پاش ئەوە بردمیەوە بۆ ماڵەوەیان تا بە خێزانەكەیمی بناسێنێ بەڵام سەرەنجام مەترسیداربوو. دایك و باوكی پرسیاری زۆریان كردبوو دەربارەم و باوكی وتی:

– بڕوانە كچم! ئێمەش دنیامان بینیووە و كەسانی دیموكراتخواز و كۆمەڵایەتین. شتێكم نییە لەسەر شێوازی بیركردنەوەت، بەڵام ئێمە كەسانێكین خەڵك دەماننناسێت... ڕاشكاوانەتر بڵێم بە باشی باست لێناكرێت! بۆیە وا چاكترە لە دووی چارەیەكی تردا بگەڕێیت...

بەگریانەوە خۆم فڕێ دایە دەرەوە. من ئەم ژیانەم نەویستبوو... من پلانی ئەم ڕووداوانەم دانەنابوو. نەمتوانی خۆم لە دەستی ئەم كەسە ناپاك و ستەمكارانە بپارێزم. خۆم نەدەپاراست، كەس لەمە تێنەدەگەیشت.

چیتر من بە کچێکی ئاسایی نەدەبینرام. ئاه.. ئەو دۆستە شۆڕشگێڕانەم منیان لای هەموو کەس وا ناساندبوو:

ئەوە نمایشەکەی "ئیلکار"یش کۆتایی هات.. لە لایەکیشەوە دڵخۆش بووم، نەمدەویست چیدی ببمە مایەی نومێدی کەس. بە هەموو هێزێکەوە بەرەو سەرکەوتن دەڕۆیشتم، دەمگوت دەبێت بە هەر جۆرێك بێت سەرکەوتن بە دەست بێنم، دەبێت تۆڵە لەوانە بسەنمەوە کە بە کچێکی سادەی بێسەروبەر پیشانیان دابووم. ئەو ڕۆژە گەورەیە هاتە پێشەوە. دەچووم بۆ تاقیکردنەوەی زانکۆ، وەکو هەموو جارێك دیسان ئەمینە لە تەنیشتمدایە بە تەنیا جێم ناهێڵێت. پێش تاقیکردنەوەکە کتێبێکی بچووکی دوعای بەناوی (جەوشەن) پێدام، هەرچەندە وتم من باوەڕم بەم شتانە نیە، بەڵام بە هۆی پێداگرییەوە وەرمگرت. وەکو ملوانکە کردم بە ملمەوە. دەبێت ئەوە بڵێم کاتێك ئەو (جەوشەن)ە م کردە ملم هەستم بە دڵ خۆشییەك کرد لە ناخمدا، لە کاتی تاقیکردنەوەکەشدا زۆر باش بووم. بە هۆی ئەمەوە شتێك بە ناوی تێکچوونی دەروونی ڕووی نەدا، لە کاتێکدا پێشتر لە تاقیکردنەوە زۆر زوو تێکدەچووم.

# بەشی سێهەم

## سالآنی زانكۆم
## كە تیایاندا كەوتمە چەندین
## داوی زۆر مەترسیدارەوە



پوختەی ئەم بەشە:

منێك كە بۆئەوەی ببم بە كەسێكی بەهێزو بتوانم تۆڵەی خۆم لەوكەسانە بكەمەوە كە منیان دووچاری ئەو هەموو ناڕەحەتییە كرد، چووم بۆ ئەستانبوڵ، لەوێش دیسان كەوتمەوە نێو داو و دووچاری سووكایەتی بوومەوە...

دوای ئەوەش ئاشكرایە...

مـن بەرگـەی گێڕانـەوەیان نـاگرم و ئێـوەش بەرگـەی خوێندنەوەیان ناگرن...

# دایکم بانگی دەکردم

ئەنجامی تاقیکردنەوەکە زۆر سەرسورهێنەر بوو. ئەو کۆلێژ و زانکۆیەی خەونم پێوە دەبینی وادەرچوو. زانکۆی ئەستەنبول کۆلێژی یاسا...

ئەمە شۆڕشی ژیانم بوو، یەکەم جار بوو ئەوەندە دڵخۆشبم و ئەم دڵخۆشییەشم بەشەو و ڕۆژ بۆ هەموو کەس باس دەکرد. ئیدی من کەسێکی گەورەبووم. بوو بوومە خوێندکاری زانکۆ و بەتایبەتیش یاساناس.

بۆ ئەوشارە دەچووم کە هەردەم لە خەیاڵمدابوو. چیتر لەمەولا کەس بەچاوێکی سووك سەیرم ناکات.. هیچ شوێنێکیم نەبینیبوو. بەڵام برادەرە چەپەکانم زۆری خەڵکی ئەستەنبوڵ بوون، زۆر باسی ئەستەنبوڵیان بۆدەکردم و ئیش و کاری ئەوێیان وەسف و سەنا دەکرد. چیتر لەچواردەورمدا کەسانی بیرتەسك و چاولەمل نابن، ئازارم نادەن، دەبمە کەسێکی هۆشمەند لەناو کۆمەڵێکی کراوە و بیرمەنددا. بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا ئەندێشەکانم بوونە مایەی دڵخۆشکردنم، بۆ یەکەمجار زۆرێك لە ئازارو بێ کەسی خۆم بیر چوویەوە. ئای چەندە جوانە! یاسا ناسێك ڕاستی و یەکسانی و دادپەروەری پێشبکەشی خەڵکی دەکات، تەنانەت بیر لێکردنەوەشی گەورەیی و ئارامی بەخشە. دواتریش دەبێتە دادوەرێکی بەناوبانگ لەسەر ئاستی جیهان و لەهۆڵەکانی دادگادا هەمیشە دەنگی

دادپەروەریت دەزرنگێتەوە بۆ پارێزگاری لە ماف خوراو و ستەم دیدەکان و گەڕاندنەوەی مافەکانیان.

تۆ بڵێی ئەمە ببێ؟ نەشبێ گرنگ نییە...

تەنها بیرلێکردنەوەشی کەیف بەخشە، مرۆڤ لە خۆشی ئەمە باڵ دەگرێت و ئەمەش بۆ من بەسە. شاری ئەستەنبوڵ و کۆلێژی یاسا بەتەواوی بیری منیان گرتبوو، بۆ یەکەمجار هەستم بەوە کرد هەموو ئازارەکانم دامرکاونەتەوە.

لەکاتێکدا ئەمانەم بە ئەندێشەدا دەهات شەوێك لە خەومدا دایکمم بینی، ئەو دایکەی نەمدەناسی و تەنانەت بە وێنەش نەمبینیبوو.

سەرلەنوێ فرمێسکەکانم دەستیان کردەوە بە ڕژان. بەڵام ئەم جارە فرمێسکی شادی بوون، دووبارە هەستەکانم ژیانەوە..."بۆ ساتێك ڕۆژە ڕەشەکانم بیرچوویەوە" نازانم لە کوێوە دەرچوو؟

دەیوت ڕۆڵە شیرینەکەم زۆر بیرم کردی بۆ سەردانت نەکردم؟ زۆر سەرسام بووم، کەسێك بمرێت دەبێت بە خۆڵ، ئێمەش دەمرین، کەوایە ئەمە کێیە لە خەومدا بانگی کردم؟ ڕەنگە هەستەکانم سەرلەنوێ پرشنگ ببەخشنەوە..

سەیرێکی خۆمم کرد، بەڵێ، دەبێ بڕۆم. دەڕۆم لەگەڵ دایکم باسی دەردەکانم دەکەم، خۆشییەکانمی لەلا باس دەکەم، دەچم تا گوندەکەمان ببینم.

لادێکەمانم دواجار لە پرسەکەی باوکمدا بینیبوو، واتە پازدە ساڵ پێش ئێستا. ئەوکات منداڵێکی زۆر بچووك بووم، ئێستاش ئەوەتا بوومەتە کچێکی گەورە، سەیرە کات چەندە زوو تێپەر دەبێت..! با بڕۆم.. بەڵام چۆن؟

بەشی دوو نان پارە لە گیرفانمدایە. ئای لە بێ پارەیی ئای...چی دەبوو رۆژێك كە پێویست بوویت، خۆت دەربخستایە. رۆژێك رووی دۆستایەتیت پیشانبدایە. !

خەریك بوو تەواو بێ هیوا دەبووم، لەوكاتەدا ئەمینەم لە پاڵمدا بینی زەرفێكی بەدەستەوە بوو. ئەمە پیشەی هەموو كاتێكی بوو هیچ كات بە ئاشكرا پارەی نەدەدامێ. هەركاتێكیش كەمێك پێداگریم كردبا خێرا دەیوت:

دراوسێیەكمان بۆدایكمی هێناوە..دەزانم كە دراوسێ و فلان و فیسار نییە ئەوەبوو باوكی مانگانەیەكی بۆ دیاری كردبووم و بۆی دەناردم. ئەمانە چەندە كەسانێكی سالارو چاكەخوازن! لەگەڵ كچێكی سەرەڕۆدا وەكو منالّی خۆیان مامەڵە دەكەن. بەڵام بۆ؟ گوایە ئەمە داخوازی باوەڕەكەیانە...

یارمەتیدانی یەكتری، پۆشتەكردنی نەدارو هەژار، دەستگیرۆیی ڕێبواران... خێزانێكی زۆر دروست و تۆكمەن، ئەگەر چی چەپرەویش نەبن بەڵام لە ئێمە دروستترن. ناچار وەرمگرت.

بەر لەوەی دەرگای زانكۆكان بكرێنەوە دەبێت سەردانی دایكم بكەم. دەسبەجێ بڕیارمداو بۆ سبەینێ كەوتمەڕێ. تا بەیانی بیرم لە دایك و باوك و براكەم كردەوە: "ئێوە مردن و ڕزگارتان بوو، ئەگەر منیش لە تەنیشتاندا ڕابكشامایە، ئەم ڕۆژە تاڵانەم نەدەدی؟! چی بكەم زۆر داوای مردنم كرد. بەڵام دەڵێی چی قەدەر.. دێم باوەش بەوزەویەدا دەكەم كە تیایدا ژیاین و لەگەڵ یادگارییەكانی ڕابوردوتاندا دەدوێم".

ئای.. مردن یا تۆ نەبویتایە یان ئێمە...

## خزمە نزیکەکانی لادێشمان مردبوون

سەرەنجام کەوتمە ڕێ، ڕێگایەکی دە کاتژمێریم لە بەردەم بوو. دوای دابەزین لەدوا وێستگە دەبێت دوو کاتژمێری تر بەپێ بڕۆیت تا دەگەیتە لادێکە. ئەمانە هەمووی لەپێناو دایکم و برا ئازیزەکەم کە تاقانەی ژیانم بوو. هەم هاوڕێ، هاوڕاز و هەم برا..

دایە بۆ لای تۆ دێم.!

خۆزگە پێشوازیت لەو کچەت بکردایە.. خۆزگە باوەشە گەرم و گوڕەکەت بۆ ئاوەڵا بکردایە..تا باوەشی پیابکردیتایە و تێر تێر بگریایە، "دایە جێم مەهێڵە". چی دەبوو ئاه چی دەبوو؟!.

نیوەڕۆیەکی درەنگ گەیشتمە لادێکە، شەکەت، ماندوو..تەنها دوو خزمم مابوون ئەوانیش بۆ دەساڵ دەچوو هیچ هەواڵێکم لەبارەیانەوە نەبوو، ئەوانیش خێزانی مامم و پورم بوون.

لادێکەمان زۆر بچووك ببویەوە. نزیکی نیوەی لادێکەمان کۆچیان کردبوو بۆ شارەکانی دەوروبەر. زۆر کەمیانم لێدەناسین، بەتەنها چەند کەسێکم دەبینی کە لە ناو ماڵە ڕووخاوەکاندا زۆر سەیر تەماشای شێوازی جلوبەرگیان دەکردم. بیری ماڵی خزمەکانم دەهاتەوە کە لەکوێدابوون. یەکەم ماڵ کە چووم ماڵی خوشکی باوکم بوو.

دەرگاکەی قفڵ بوو. ئەم ماڵە لەزووەوە چۆڵ کرابوو. لەو ناوەدا مامە پیرەیەکم دی و پرسیاری ماڵی پورم لێکرد..

مامەی بەساڵاچووش هاتە گۆ: چۆن نایناسم (گولیزار خان)؟! بەڕاستی کەسێکی نموونەیی و زۆر سەر ڕاست و دروست بوو، خوشکی دونیا و دوارۆژم، تەمەنی درێژی بۆ ئێوە بەجێهێشت.

لەوێدا شۆکێکی تر لێیدام، یانی پوریشم مردووە ! کۆتا یادگاری خێزانەکەم. با بمرن ئەو کەسە پاکانە. ئەوانە ئیشیان بەم دونیایە نییە.. هەمیشە دونیا بۆ کەسە لارەکان ماوەتەوە، مرۆڤە چاکەکان هەمیشە بوونەتە قوربانی لەم دونیایەدا..

کە هەواڵی مردنیم بیست، لەناخمدا شتێك دروست بوو. ئاخ مردن چۆن بتکوژم، چۆن لەناوت بەرم؟ تۆ کە هەموو کەسە خۆشەویستەکانم لەدەست دەسێنیت و بزریان دەکەیت، چی دەبێت منیش بەرەو پزگارم کە لە دەستی ئەو بێ ئەرزشانەی ژیانیان کردووەتە مەڵبەندی ڕابواردنی خۆیان...

خوا چاکت بۆ بکات...

لەم پرسیارەوە مامە پیرە هەستی بە نامۆیم کرد و پرسی: کیژی خۆم تۆ کێیت؟ چی ئەویت؟

کە ناوی باوکم وت، بە هۆی ئەو ناوبانگە خراپەی کە تا دێکەشمان گەیشتبوو وتی: تێگەیشتم، تێگەیشتم. ئەوجا سەرێکی لەقاند بەدەم خۆیەوە: ڕۆڵە خوا بە چاکی خۆیت لەگەڵ بکات. دەبێت شتێکی بیستبێت .. لەوانەیە لەوەی بەسەرم هاتبوو زیاتریش. چونکە هەواڵی خراپ زوو بڵاو دەبێتەوە. زۆر باش دەزانم چی دەربارەی من وتراوە. من کچێکی باش نەبووم بۆ ئەم لادێیە تەنانەت یەکێك بووم لە نەفرەت لێکراوەکانی ئەم خاکە پاکە.

مامە پیرە بەردەوام بوو:

باوك و دایکیشت کەسانێکی زۆر بەڕێز بوون، بەتایبەتی دایکت. خانمێکی فریشتە ئاسابوو، دڵی پڕ لە ئیمان و زمانی هەمیشە بە قورئان

بوو، هەمیشە وانەی قورئانی بەلاوانی ئەم دێیە دەوت و بابەتی دین و ژینی تێدەگەیاندن.

لە مەبەستی مامەی ڕدێن سپی تێگەیشتم...

لەباوك و دایکێکی چاکەوە چۆن کچێکی ئاوا پێدەگات؟ دەیویست پێم بڵێ تۆ بێزراوترینی هەم خێزانەکەت و هەم دێیەکەشمانی. مامە پیرە زۆر لەسەر هەق بوو چونکە ئەگەر دایکم بمایە و منی بەم حاڵەوە دیتبا شتێکی لەمە کەمتری نەدەوت.

ئاخ دایە..ئاخ ئەگەر تۆ لە ژیاندا بویتایە، ئەگەر لەبەر خاتری تۆش بوایە قورئانم دەخوێند و نوێژیشم دەکرد. دایە ئەم بێ کەسیە ئازاری زۆر جیاوازە. دەزانم تۆ ناتوانی بێی بۆ لام، بەڵام وا من دێم بۆ لات، هەرگیز ناتوانم ببمە دۆستی ئەم ژیانە، دایە زۆر زووش دێم...

لەم دونیایەدا ئارامترین شوێن مەزارگەیە. هیچ نەبێت لەوێدا کەسانی نەفس نزم یاری بە هۆش و هەست و کەسایەتیت ناکەن و دڕندە برسییەکانیش پەلامارت نادەن.

لەکاتێدا ئەمانە لەمێشکمدا هاتوچۆیان دەکرد پرسیارەکانی مامە پیرە بەردەوام بوو:

– کچم ئێستە چی دەکەیت ؟

– ئامادەییم تەواو کرد و کۆلێژی یاسام بەدەست هێناوە.

– واتە دەبیتە پارێزەر؟

– بەڵێ.

مامەپیرە سەری سوڕما و ئەبڵەق بوو.

یا الله! دنیا بۆ کێ بوو؟

لای کردەوە و ڕۆیشت...

دەبێت ئەم پیرە پیاوە دانیشتوانی گوندەکە بناسێت. بەر لەوەی زۆر دوور بکەوێتەوە بانگم لێکرد: مامە! یەك دەقە ...

مامم و خێزانەکەشی لێرە دەژیان، داخۆ ئێستاکەش لێرەن؟

ئەوانیش لەوێن. ئەوانیش ڕۆیشتن...ڕۆیشتن.

بە دەستی ئامارەی بۆشوێنێك کرد کە پێم وایە مەزارگە بوو

واتە ئەوانیشی لێ فڕاندم؟ واتە من لەم گوندەدا کەسم نەماوە، وایە؟

بێ چارە بەرەو مەزارگەکە ملی ڕێگەم گرت. دۆستی گیانیم، خۆشەویستانم، بەختەوەران هەموو لەوێدا نوستبوون.

هاتنی منیان هەست پێنەدەکرد. ئاساییە من لەگەڵ خۆڵی زەوییەکەیاندا، لەگەڵ بەردەکاندا، لەگەڵ ئەو گیایەی لەسەر مەزارەکانیان ڕوواوە قسەدەکەم و دەردی دڵی خۆمیان لا باس دەکەم، ئەمە بۆ من بەس بوو. لەکاتێکدا بەرەو گۆڕستانەکە دەڕۆیشتم، جۆش و خرۆش و لەرزێك هەموو گیانمی داپۆشی، وەکو بەرەو دنیایەکی تەنگەڵانی نادیار بڕۆم وابوو. بۆ ساتێك چی خەیاڵ هەبوو لە مێشکم دەرچوو. چی لە چواردەورمدا بوو بەرەو گۆڕستانەکە دەڕۆیشت، دەستێکی نادیار لەپشتەوە پاڵی پێوەدەنام و لەپێشیشەوە ڕایدەکێشام. وەك بەزۆر بمبەن وابوو.

سێ گۆڕ بەتەنیشت یەکەوە: دایکم، باوکم و براکەم.

لەلایانا چۆکم دادا، هەستێکی سەیر دەروونمی گرت. لەناکاو خۆم لەناو دەریای خەم و پەژارەدا بینییەوە. بێچارە لەگەڵ شەپۆلەکانیدا دەجەنگام. چیتر بەرگەی ئازار و مەینەتی ئەم بارەم نەدەگرت. بۆیە دەستم کردە پرمەی گریان و هاوارم دەکرد تکایە چی دەبێت منیش بەرن...!

بەدەم ماچ كردنی مەزارەكانیانەوە دەموت: بەتەنها مامەوە نام نێژن؟ بێ ئێوە ناتوانم بژیم، زۆر غەریبی ئێوە دەكەم. زەمبەلەكەكانی ژیان زۆریان شێلام، تا چیتر ناشیرینترو بێزراوتر نەبووم، دایە ئەم كۆرپەیەی خۆت بەرە!...

بیرم نایەت چەندە خۆم هەڵڕشت و چەندە گریام لەسەر قەبری دایكم، ڕاكشام و دەمویست پەنا بەرمە بەر ئامێزە پڕ لە خۆشەویستییەكەی و سینە پاكەكەی و دەستە نەرم و شلەكانی بگوشم، بۆ ئەو خۆشەویستی و نەرم و نیانییە دەگەڕام چونكە ئەو هەستەم هیچ نەچەشتبوو. بۆجارێكیش بێت..

## لەسەر مەزارەكەی دایكم بێ ئاگا كەوتبووم

نازانم كات چەندە تێپەڕیبوو، چەندە هاوارم كردبێت و لاڵابێتمەوە و چەندە فرمێسكم ڕشتبێت؟ پێدەچێت لە چواردەورەوە دەنگم زۆر بیسترابێت، بۆیە بەدەنگی ئافرەتێك هاتمەوە سەرخۆ..

– ئازیز گیان گریان لەسەر مەزار باش نییە، وەرەوە سەر خۆت.

– هەرچۆنێك بێت بەزۆر خۆم ڕاست كردەوە.

لەپشتمەوە ئافرەتێك و پیاوێك وەستابوون. ئافرەتەكە دەستی گرتم و یارمەتیدام تا هەستمەوە، ڕووی كردە ڕووخساری پڕ لە فرمێسك و خەمبارم، لەسیمایدا دۆستایەتی و ڕاستگۆیی دەخوێنرایەوە، پرسی:

– كچی خۆم تۆ كێیت؟ تۆمان هیچ لێرەدا نەدیوە. ئەم مەزارانە پێم وابێت هی هەردوو ڕەحمەتی (مەلەك ئەحسەنە و داود ئەفەندی)ن، دەبێت تۆ هیچی ئەوان بیت؟

واتا لە دێیەكەدا بە دایكمیان وتووە (مەلەك ئەحسەنە)، خۆی لەڕاستیدا ناوی (ئەحسەنە) بوو، بەڵام بە هۆی ئەو دڵسۆزی و ڕاستگۆیی و

دەست پاکی و چاکە خوازییەی لەگەڵ خەڵکی لادێکەدا ئەنجامی دابوو نازناوی (مەلەك)یان بەسەردا بڕیبوو.

زۆر بەشەرمەوە وتم: "کچی ئەوانم".

– ئای گیانەکەم –لە ئامێزی گرتم– کەواتە تۆ (ئایسێل)یت؟!

سەرم ڕاوەشاند بەڵێ.

– هەواڵت باش نەهاتووە. هاوەڵی کەسانی خراپت کردووە، هەرچەندە باوەڕمان نەدەکرد لە دایکێکی دەست و داوێن پاکەوە کەسێکی ئاوا دەربچێت!.

– خۆزگا نەبوومایە! تا دایکێکی فریشتە ئاسا لەکەدارنەکەم. ئەمە شتێك نییە لێخۆشبوونی هەبێت. ئەم ئافرەتە بەڕێزە ڕاستی بیستبوو بەڵام هەستی ناسکی نەیدەهێشت لە ڕوومدا بیڵێت.

– ماشاء الله چ کچێکی شیرینیت! دەی ئازیزم خۆت کۆکەرەوە..

وەك بڵێم ئێوە کێن، سەیرێکی دەموچاویم کرد، هەرچۆنێك بێت تێگەیشت و خۆی ناساند.

من خێزانی ئیمامی ئەم دێیەم، ئەوەی تەنیشتیشم مامۆستای هاوسەرمە.

مامۆستاش سەرێکی لەقاند.

من لەسەردەستی دایکی ڕەحمەتیت پێگەیشتم، بەمنداڵی وانەی قورئانم لەلای ئەو خوێندووە، پەروەردگارم بەهەشتی خۆیی پێ ببەخشێت و شوێنی لە گەڵ چاکەکاراندا بێت.

– خێزانی مامۆستا دەستی گرتم: وەرە کچم دەزانم لەدوورەوە هاتویت، با بچینەوە ماڵەوە و پێکەوەش هەندێ باس و خواس بکەین.

سەیری ئەو دیمەنە بکەن! لەکاتێکدا هەمووان بە چاوێکی سووکەوە سەیریان دەکردم، کەچی مامۆستا و خێزانی بوونە یارمەتیدەرم و بە ڕووخسارێکی گەشەوە دەیاندوانم و قسەیان لەگەڵدا دەکردم.

هەرچەندە زۆر خۆشیم لەو کەسانە نەدەهات کە وابەستەی دین بوون، وەلێ ڕەفتاری هەنگوین ئاسای ئەو دووکەسە نیانە ئەوهەستەمیان لەخۆیاندا ونکرد. کەمەندکێشیان کردبووم. بەرەو ماڵی مامۆستا بەڕێ کەوتین، بەڵام وەکو هەر جارێك گومان و دوودڵی لەدڵم دەرنەدەچوو، بۆ ئەوە دەگەڕام کە بزانم چ مەبەستێکیان بەم بردنەوەیەم هەیە.

ڕاستتر لەو فیلمە تورکییانەی بینیبوومن، ئیمام ڕۆڵێکی ناشیرینیان پێدرابوو. بۆیە لە ناخمدا شتێکی جیاواز درووست ببوو. ماڵێکی زۆر سادە، زۆر خاوێن، هەوای ئاسودەیی لێوە دەهات، باخچەیەکی بچووکی هەبوو، دوو منداڵیشیان هەبوو. یەکێکیان لە ئامادەیی بوو ئەوی تریش لە ناوەندی دەیخوێند، هەردووکیان لەسەرخۆ و ئاکار شیرین.

لە ماڵی مامۆستادا ئاسودەییەکم هەست پێدەکرد کە لە هیچ شوێنێکی تر بەدیم نەکردبوو. نەمدەتوانی ناوێکی لێبنێم.

بەڵێ.. هەندێ جار سەرم لە کاری خۆم دەرنەدەکرد. بوونم لەگەڵ گرووپی شۆڕشگێرەکاندا بۆ خۆی لەبەر کۆمەڵێك ڕاستی بوو. چونکە ئەوان هەڵگری کۆمەڵێ بیرو باوەڕ بوون وەك (ئازادی و سەربەستی و یەکسانی و دادپەروەری).

هۆکاری سەرەکیش لە دژایەتیکردنم لەگەڵ باوەڕدارەکاندا تەنها دوور لە دینیم بوو. نازانم بۆچی هەمیشە ئازار و مەینەتیم دیوە لەدەست ئەوانەی ئازادی و یەکسانی دروشمیان بوو و خۆیان بە پارێزەری ئەو چەمکانە دەزانی!!!

بۆچی ئەم کەسانە ژیانمیان ڕەش کرد و منێتییان لێم سەندەوە؟ لە ڕاستیدا تاوانی یەك کەس نابێتە تاوانی هەمووان. بەڵام من هەمیشە گیرۆدەی ستەم و پلیشانەوە دەبووم.

مامۆستا و خێزانەکەی ئەوەندە گرنگییان پێدەدام بەجۆرێك لە ژیانمدا هەڵسوکەوتی ئاوهام بە خۆمەوە نەدیبوو. سەرەڕای ئەوەی شتانێکی زۆریان دەربارەم دەزانی، بەڵام بەلایانەوە گرنگ نەبوو. مامەڵەی کەسێکی خانەدانیان لەگەڵ دەکردم. لەسەر داوای زۆری خاتوون لەگەرماوەکەیاندا کە لەسەر نەریتی لادێ کرابوویەوە بانیۆیەکم کرد. دواتر لەژوورێکدا کە پێشتر بۆی ئامادەکردبووم ٤ تا ٥ کاتژمێر خەوتم، کە هەڵیشسام سفرە و خوانێکیان ڕێکخستبوو شایستە بە شاژن.

ڕاستییەکەی زۆر کەیفم کرد و گەلێك کاریگەریشی لەسەرم بەجێهێشت، زۆر سەرم سوڕمابوو، مەگەر لەم ژیانە پڕ لە کێشمەکێشەدا کەسانی ویژدان زیندو و بێگەرد هەن..!

## لە خەونمدا خێزانەکەم لە بەهەشتدا بینی :

ئەو شەوە ڕووداوێکی زۆر سەیرم دی کە تا ئەمڕۆش شوێنکاری لەسەرم ماوە. بە جۆرێك نەمتوانی شیکردنەوەیەك و لێکۆڵینەوەیەکی بابەتییانە بۆ ئەو خەوە بکەم. من هیچ باوەڕم بە خەو نەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر خەوی جددیم نەبینیوە، زۆرجار هەندێ خەوم دیوە بەڵام گوێم پێ نەداوە. گەرچی ئەمەیان جیاواز بوو...

کەمێك خۆم کۆ دەکەمەوە و بۆتانی دەگێڕمەوە:

– مامۆستا و خێزانەکەی لەخانوویەکی دوو ژووریدا دەژیان. ژوورێکیان بەمن دا. ژوورێك کەبۆنی میسکی لێدەهات، زۆر ڕێك و خاوێن بوو، بەتەنها منی تیابووم. چوومە خەوێکەوە دوور لە هەموو ژاوەژاوێك و سەرئێشانێك.

باوەڕم وایە لەژیانمدا ئەمە یەکەمین خەوم بووبێت وا ئاسوودەو شیرین. جێگەیەك لەسەر زەوییەکە ڕاخرابوو. چارچەف، بەتانی، سەرین، هەموو پارچەکانی یەك لەیەك ڕازاوەتر. بەداخەوە کە لەسەر ئەوجێگەیە منێکی تاوانباری بێزلێکراو ڕاکشابووم.

بەتایبەتی ئەوخاتوونە بەڕێزەش هەر جار نا جارێك دەهاتە لام و دەیوت:

"گوڵەکەم پێویستییەکت نییە؟ هەرچییەکت پێویست بوو ئێمە لە خزمەتتدایـن". مەگەر ئێوە ئەم هەست ڕاگرییە لە چ قوتابخانەیەك فێربوون؟!..

ئەی ئەوانەی کۆلێژتان تەواوکردووە، ئەی زانایان، ڕۆشنبیران، چاوەکانتان بکەنەوە...

بە بۆچوونی من دەبێت ڕەفتاری خەڵکی ئەم گوندە وەك وانەی ئاکار بەرزی لە زانکۆ و پەیمانگا و قوتابخانەکاندا بوترێتەوە. لەبەرامبەر ئەو بایەخە گەرم و گوڕ و ڕەفتارە ناسکانەدا شەرم دایدەگرتم و بچووك دەبوومەوە.

چوومە خەوێکی قووڵەوە...

شارێك کە تا ئەو کات نە بینیبووم و نە بیرم لێکردبوویەوە، شارێکی دڵڕفێن لە جوانیدا، لەناو باخچە سەوزەکانیدا کۆشکی قەشەنگی جوانتر لە جوانەکان دەبینران.

شارێك لێوان لێو لە ئاسوودەیی و بەختەوەری...

خۆم لەناو جوانییەکی مەستکەردا بینییەوە. بەتایبەتی شوێنێك کە نەمدەزانی کوێیە، کەوتمە دوودڵییەوە.. بۆ خۆم لێکدانەوەم دەکرد، بەردەوام دەموت: نا ئەمە نابێت شوێنێك بێت لە تورکیا. چونکە

شارێکمان نیە کە خاوەنی ئەو هەموو جوانی و دڵگیرییە بێت. تۆ بڵێی شارێکی ئەورووپی نەبێت؟ لەکاتێکدا لەم بیرکردنەوانەدا بووم پیتی عەرەبی بەدەرگای هەندێ لەکۆشکەکانەوە سەرنجی ڕاکێشام. لەبەرئەوەی نەمدەزانی بیخوێنمەوە بۆیە ماناکانیشیانم نەدەزانی، بەڵام لەوێدا ئەم بۆچوونەم بۆهات کە پێدەچێت شارێکی عەرەبی بێت.. بەڵام وەکو ئەوەی بیستبووم شارە عەرەبییەکان لەکۆمەڵێ زەوی وشك و کەم ئاو پێکهاتبوون.

لە منداڵییەوە وشەی "بەهەشت" لەناخمدا جێگیر بووبوو، چوونکە مامۆستای وانەی ئاین زۆر جار باسی بەهەشت و تایبەتمەندییەکانی بۆ دەکردین، منیش تێڕادەمام، بەڵام پاش کەمێك بەهۆی ئەو بیرە پووچە ماددییەمەوە وازم دەهێنا. بۆیە دەموت شتی وا دروست نییە، مرۆڤ کە مرد دەبێت بە خۆڵ و چیتر زیندوو نابێتەوە. (بەهەشت) یا (دۆزەخ) بونیان نییە.

لە خەوەکەشمدا ئەم دوو بۆچوونە دژە بێزاریان کردبووم، بەڵام ڕوون بوو کە لە شوێنێکی وەك (بەهەشت)دا بووم. بەشەقامە خاوێنەکانی شارەکەدا، بەسەر پرەکانیدا و بەناو ئاوەکانیدا گوزەرم دەکرد، بە هەرکەس دەگەیشتم پرسیارم لێدەکرد تا زانیاریم دەست کەوێت. بەڵام کەس لای بۆ نەدەکردمەوە و سەیری نەدەکردم، جل و بەرگ و پۆشاکیان ئەوەندە ڕازاوە و درەوشاوە بوو سەیری هەر کوێم دەکرد حەیران دادەمام...

بێ ئەوەی بزانم لەکوێوە هات براکەم بەرامبەرم دەرکەوت، سەرم سوڕما و پەشۆکام.

هاوارم کرد: "کاکە" تێر باوەشم پێدا کرد، بۆنی میسک ئاسای سەرتاپای ناخمی گرتبوو. بەدەنگە خۆش و بوێرەکەی خۆی وتی: مەگری ئایسێلْ! وەرە با بتبەم بۆ لای دایە گیان.

– دایکیشم لێرەیە؟ بۆ ئێرە کوێیە؟

– وەڵامی نەدایەوە.

– دووبارەی کردەوە: دەتبەم بۆلای دایکم.

کاکەم لەپێشەوە و منیش بەدوایدا، وەکو ڕابکەین، بەجۆرێك نە ڕامان دەکرد و نە بە هێواشیش دەڕۆیشتین، بەڵکو دەفڕین. بەڵێ دەفڕین. چونکە پێمان بەر زەوییەکەی نەدەکەوت.

لەگەڵ کاکەمدا لەو شارە ئەفسوناوییەدا نازانم چەندە گەڕاین.. !

لە بەردەم تەلارێکی بێ وێنەی ڕازاوەدا سرەوتین. بێ ئەوەی پرسیاری لێبکەم بەدوایدا دەڕۆیشتم، کە چووینە باخچەی تەلارەکە بێ ئەوەی بپرسم، ئەو ڕوونکردنەوەی کرد:

– ئێرە مەنزڵی ئێمەیە، دایکیشم لە ژوورەوەیە...

– باوەڕ ناکەم، دەلەرزم.. لەماڵێکی دوو ژووری کە خەریك بوو دەڕووخا بە سەرماندا بۆ تەلارێکی ناوازەی بەرین!

پرسیم چۆن ئێرەتان دەست کەوت؟

بێ وەڵام مامەوە...

پاش کەمێك خانمێك بەرەو ڕووم هات. پێویست نەبوو کە بڵێ ئەوە دایکمە ...

ئەوەی بیرم لێدەکردەوە دەربارەی دایکم لە (شێوەی ڕووخسار، باڵای، پێستی، شۆخ و شەنگی) هەمووی وەکو خۆی بوو. واتا وێنای ڕاستەقینەی دایکم لەئەندێشەمدا کێشابوو. لەگەڵ یەکەم بەریەك کەوتنی

نیگاکاندا خۆم هاویشته ئامێزی دایکمەوە. ئەو ئامێزەی کە چەندەها ساڵ بوو ئاواتیم دەخواست و تامەزرۆی بووم.

– بەدەنگێك کە ناخمی تاودەدا و ئازارەکانمی کپ دەکردەوە وتی: ئایسێل، ڕۆڵە شیرینەکەم!.

منیش بەردەوام بەبێ وەستان دەگریام. تا توانیم سەرم بەسنگییەوە نووساند و، سییەکانم پڕکرد لەو بۆنی دایکایەتییەی کە دەمێك بوو تامەزرۆی بووم.

ئای.. دایکە چ خەو بێت، چ خەیاڵ، هیچ شتێك لەزەتی ئەم پێك گەیشتنەوەیە نادات... بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەمە خەوە.. تۆ ناتوانیت ئاڕاستەی بکەیت، شتێکە لەژێر نەستدا شاراوەیە، لەچەند چرکەیەکدا دێت و ون دەبێت. دایکم وتی:

کچم دوو ڕاسپاردەم بۆ بەجێ هێشتویت. ئەوانە خۆشەویستترین ڕاسپاردەن لە لای من. لەناو سندوقێکی شوشەی بچوکدایە لەماڵەکەی خۆماندا. دەری بهێنە با لای تۆ بێت. زۆر جوان چاودێری و پارێزگاریان بکە.

سەرەڕای ژوانی ئەویندارانم، دەبینم حەسرەت و تاسەکانی دڵم بە تەواوی نەڕەویوەتەوە. دەتوت ڕوانینەکانم لەدووی شوێنەواری شتێك، کەسێك دەگەڕان.

باوکم...باوکم، مەگەر باوکم کوانێ؟؟؟

– ئەو هێشتا نەهاتووە، من و براکەت لێرە دەمێنینەوە. لێپرسینەوەی ئەو درێژەی کێشا، ئێمەش چاوەڕێین، پشت بەخوا لێپرسینەوەی ئەویش کۆتایی دێت و دێت بۆ لامان.

بەخەبەر هاتم .. لەسەرخۆم نیم، لەناو فەریاد و هاوارێکی زۆردام. خێزانی مامۆستا دەبوو گوێی لە دەنگ و هاوارم بووبێت کە هاتە ژوورەکەمەوە وتی: کچم ئایسێلٚ وەرەوە سەرخۆت .. پێدەچێت خەوێکت بینیبێت.

بە وێنەی دایك نامی بە سنگییەوە و لە ئامێزی گرتم.

– چی بووە ئایسێلٚ؟

– هیچ نەبووە تەنها خەوێکم بینی.

– خێرە إن شاء الله.

– ئێوەشم نارەحەت کرد، وایە؟

– ئەوە چ قسەیەکە! نارەحەتکردن مانای چییە؟

مامۆستا بۆ مزگەوت چوو و منیش بۆ نوێژی بەیانی هەستام.

چەندە کەسانێکی باشن، ئێوە لە چ سەردەمێکدا ژیاون... بەرامبەر یەکتریش زۆر بەڕێزن، قسە کردنەکانیانم بە هەند وەرگرت. مامۆستا بە خێزانەکەی دەوت (خانمی بەڕێز) خێزانەکەشی بە مامۆستا (مامۆستای بەڕێز)ی دەوت. ئەوەنـدە بە نـەرمی دەدوان، ئیرەیـم بـەم خێزانـە بەختەوەرە دەبرد ...ئەویش لەوەوە بوو ژیانێکی وام نەدیبوو.

دووبارە ڕاکشامەوە. کە ڕۆژ بوویەوە یەکەم هەوڵم ئەوە بوو بچمەوە مالّی خۆمان بۆ ئەوەی ئەو دوو ڕاسپاردەیە بهێنم کە دایکم بۆی جێهێشتبووم، بەڵام دەترسام لەو مالّە چۆلّە .. ئەگەر خێزانی مامۆستاش بهاتایە پێکەوە دەچووین...

بەڵام باوکم بۆ چی دیار نەبوو؟ واتای چی لێپرسینەوەی ئەو درێژە دەکێشێت؟ لەم قسانەی دایکم تێنەدەگەیشتم. مامۆستا ئەمەی بۆ ڕوون کردمەوە:

پیرۆزبایت لێ دەکەم. ئەم خەوەی بینیوتە لەلایەن پەروەردگارەوەیە. واتە خەونێکی ڕاستە. ئەو شوێنەش بەهەشتە. دایك و براکەت بەهەشتین، باوکیشت لێپرسینەوەکەی تەواو نەبووە.

بەڵێ ئەمە بۆچوونی ئەو بوو. هەرچەندە ڕاستیش نەبێت بەڵام مرۆڤ دڵخۆش دەکات. بەلایەنی کەمەوە دەبینم کە دایکم و براکەم بە ئارامی گەیشتوون و ئاسوودە بوون. ئەو خەوەی کە بۆ مامۆستام باس کرد زۆر پێی کاریگەر بوو، لەگەڵ خێزانەکەیدا دەستیان کرد بە گریان. لە ماڵەکەدا بۆ ئەو ڕاسپاردانە دەگەڕاین کە دایکم بۆی جێهێشتبووم.

پێکەوە چووین بۆ ماڵە کۆنەکەی خۆمان، چەند کەسێکی ئەو لادێیەش کە پێیان زانین هاتبوون بۆ سەیرکردن. هەر کەسێك پرسیارێکی دەکرد. هەندێکیان پرسیاری بێ مانا، هەندێك پرسیاری دەکرد تا بزانن لە چی دەگەڕێین، هەندێکیش تەنها مەراق، یان لە بێ کاریدا ...

مامۆستا، دەبێت بەجێت بهێڵم، چونکە پەرستارەکان کارەبایان لێکوژاندمەوە. دەبێت بخەوم گەر نا سبەی ئازارەکانم زۆرتر دەبن.

بەهیوای ئەوەی بتوانم بەردەوام بم، ئێستا مۆڵەت دەخوازم...

## دووبارە پێکەوەین مامۆستا..

دەتوانم دان بەوەدا بنێم کاتێك دەنووسم، هەموو ئێش و ئازار و بێ ورەییم دادەمرکێتەوە و سرووەی ئاسودەیی دەروونم فێنك دەکاتەوە. سەرەڕای ئەو هەموو سەرەنجامە خراپە، نەخۆشییەکەم زۆر بەە خێرایی بڵاودەبێتەوە. شێرپەنجە هەموو لاشەمی تەنیووە.

– هەموو کەلوپەلی ماڵەکە لە جێی خۆیاندابوون، لە ناو تەپوتۆزێکی زۆردا...کەس دەستی لێنەدابوون. سەربانەکەی لە زۆر شوێندا نیشت بوو و دیوارەکانیشی قڵێش قڵێش ببوون.

یەکێك لە گوندنشینان وتی:

– بەدڵنیاییەوە ئەمە دەڕووخێت. هەر هیچ نەبێت کەلوپەلەکانیشی دەر بهاتایە باش بوو. کەلوپەل واتە یادگارییەکانی دایکم.. هەموو دنیاکەی لێرەدا بوو. دەستی لەهەموو شتێکی دابوو، پێی بە هەموو شوێنێکیدا نابوو.لە هەموو سوچێکیدا یادگاری ئەو هەبوو. ئای دایە! بەمانە توانیت بەختەوەری و دڵخۆشی بە دەست بهێنیت! ئێرەییت پێ دەبەم...

یەکێکی تر لەو ناوەدا وتی:

– بە پوری ڕەحمەتیتمان زۆر وت با ئەم کەلوپەلانە بە زایە نەچێت. دەستی لێنەدا. تا مردیش هەر دەهات پاکی دەکردەوە و چاودێری دەکردن و دەیپاراستن، کە مردیش ئاوای لێهات. گوێم لەهەندێ لە قسەکانیش نەبوو، چونکە بیرم لەلای یادگارییەکانی دایکم بوو، بەتایبەتی ئەو دوو ڕاسپاردەیەی کە بۆی جێهێشتبووم، بەردەوام بۆیان دەگەڕاین، هەرچەندە ئەوان ئاگایان لەمە نەبوو.

– مامۆستا و خێزانی و من..

لەیەکەم ژووردا سندوقەکەمان نەدۆزیەوە، هەر کە چووینە ژوورەکەی تر لە تەنیشت قەنەفەیەکی داری ڕزیودا بینیمان سندوقێکی شووشە کە شوشەکەی شکابوو چاوەڕوانی دەکردین، ئەوە یادگارییەکەی دایکمە. پێدەچێت دیاری کاتی بوکێنی بێت!... هەر کە سندوقەکەم بینی دووبارە هەستێکی نامۆ ڕووی تێکردمەوە. دەستم کرد بە لەرزین. خێزانی مامۆستا قۆڵی کرد بە قۆڵما هەر لە شوێنی خۆمدا دانیشتم.. ئەوە تەنها چاوم نەبوو کە دەگریا بەڵکو ناخ و دڵ و گیان و هەموو جەستەم ..

مامۆستا سندوقەکەی کردەوە. تەنها دوو کتێبی تێدابوو.

یەکێکیان (قورئان)ێك بوو، کە زۆر کۆن ببوو. ئەوی تریشیان کتێبێك بە ناوی (وتەکان)، کە یەکێك بوو لە شاکارەکانی بدیع الزمان مامۆستا (سەعیدی نورسی).

ئەو دوو ڕاسپاردەیەی کە دایکم پێی سپاردم، ئەمانەن؟ زۆر سەرم سوڕما. لە ڕاستیدا چاوەڕێی شتی وام نەکردبوو؟ چونکە لە بنەڕەتدا من بیرم یەك نەدەهاتەوە لەگەڵ ئەمانەدا .گرفت نیە، مادام یادگاری دایکم بوون ئەوانە دوو شتی پیرۆزن لای من.

مامۆستا زۆر بە کورتی باسێکی مامۆستا سەعیدی نورسی کرد:

مامۆستا سەعید زانایەکی هەڵکەوتووە کە لەم وڵاتەی خۆماندا ژیاوە. چاکساز و هەڵکەوتووی سەردەمە. کتێبەکانی بە هەموو دنیادا بڵاو بوونەتەوە و ڕەچەتەیەکی ناوازەیە بۆ زامە ڕۆحی و هزرییەکانی مرۆڤی نوێ. نوسراوەکانی گرنگی مەزنیان هەیە بە تایبەتی لای گەنجان، چونکە وەڵامگۆی زۆربەی کێشەکانیانە. لە ڕوویەکەوە خۆم بە بەختیار دەزانی چونکە شتگەلێکی زۆر هەبوون کە لەدوویان دەگەڕام.

## مامۆستا دەرچووی کۆلێجی یاسا بوو...

مامۆستا بەردەوام بوو: من ئەم کتێبانەم کاتێك ناسی کە لە کۆلێجی یاسا دەمخوێند. ئەو دەمە زۆر سودم لێ بینی، بیریان فراوان کردم و کۆمەڵێکی زۆر پرسیار و گومانیان لە مێشکم ڕەواندەوە.

بوەستە! بوەستە! واتە مامۆستا دەرچوی یاسایە؟ سەیری ئەو دیمەنە بکەن. هەم مامۆستا و هەم یاساناس! لەگەڵ ئەوەشدا دنیایەك ڕێز و خۆشەویستی لێ دەبارێ. ئەو ڕۆژەش خێزانی مامۆستا بەری نەدام ... بە هەموو نیانی و میوان دۆستییەکییەوە لە خزمەتمدا بوو. تێر تێر پێکەوە قسەمان کرد.

مامۆستا کەسێکی زۆر ئیماندار و ڕووناکبیر بوو. گەر هەموو مامۆستایانی ئاینی وەك ئەو بوونایە، نە بێباوەڕی دەما و نە کێشمەکێشمی ناو کۆمەڵگا... وەك دەروونناسێك لە خەڵك نزیك دەبێتەوە، بە سنگ فراوانییەوە گوێ لە کێشەکانیان دەگرێت و چارەیان دەخاتە بەر دەست. ئەم ڕێگایە بە تەنیا مامۆستایانی دینی پێویستیان نییە. بەڵکو هەموو پەروەرشیارێك، بەتایبەتی مامۆستایانی قوتابخانە. گەر مامۆستایان لە دەروونزانی منداڵ و خوێندکاران شارەزا بن، ئەوا نە خوێندکار لە خوێندنگا دەتۆرێت، نە ڕێژەی نەخوێندەواریش زیاد دەکات.

ئایا مرۆڤ بە توندوتیژی و وتەی ناشیرین پەروەردە دەبێت؟ هەرکات خۆشەویستی وەك کلیلێك تەماشا کرا ئەوا دەروازەیەك نامێنێتەوە بەداخراوی و سەرجەم گرفتەکانی کۆمەڵگا بەسانایی چارەسەر دەبن.

## لەکاتی قسەکردنماندا تووڕە بووم

ئەو بێ هەستانە، ئەو دەمارگیرانە بەم حاڵەیان گەیاندین. وازمان لێ ناهێنن، نایەڵن وەکو مرۆڤ بژین. (مەبەستم پیاوانی ئاینی نەبوو.) باسی ئەو دۆستانەم دەکەم کە لووتیان بەر ئاسمان دەکەوت و بۆ زەوییان نەدەڕوانی. ئەو دۆستە دەمارگیرانەم. بەڵام وا دیار بوو سەرەتای قسەکانم هەڵە تێگەیشتن...

کەمێك سەیری چاوی مامۆستا و خێزانیم کرد، بەڵام هیچان نەوت (هیچ کاردانەوەکیان نەبوو). منیش زانیم کە هەڵەیەکم کردووە، بەڵام نەم دەزانی لە کوێوە دەست پێبکەم بۆ ڕاستکردنەوەی.

مامۆستا بە شێوازێکی زۆر هێمن و لەسەرخۆ:

ئایسێل کچم! هیچ مافێکم نییە شتێکت پێ بڵێم، ئێمە تاوانبارین. ڕاست دەڵێیت، ئێمە وەکو مامۆستایانی ئاینی دەبێت لە هەموو حاڵ و

بزاوتێکماندا نموونه بین. ئێمه مافی ئەوەمان نییه هەڵه بکەین. دەبێت ئێمه زۆر بزانین و زۆر بخوێنینەوە. پێویسته قسەکانمان، زانستەکانمان له هەڵسوکەوتماندا ڕەنگ بدەنەوە...

مامۆستا کەسایەتییەکی لێبووردەی هەبوو و خاکێتی کردبووه دروشم. ئەم هەڵوێستەی تەواو سەرسامی کردبووم.

هێزی ئەوەم نەبوو ڕاسپاردەکانی دایکم هەڵگرم. واته لای من بێت چونکه خۆم به شایانی نەدەزانی. کچێك که خاوەنی زۆرترین تاوانه، له هەموو ڕوویەکەوە ناشیرین کراوە و ورەی ڕووخێنراوە، توانای گواستنەوەی قورئانی پیرۆزی کوا؟!

تکام له مامۆستا کرد ئەو هەڵیانگرێت، ئەویش تکاکەی قبوڵکردم.

جەنابی مامۆستا وتی: وا باشتر بوو لای خۆت بێت، ئەم ئەمانەتانه بەهێزت دەکەنەوە و خۆڕاگریت پێدەبەخشن.

پێدەچێت ڕاست بووبێت، بەڵام من کەسێکی وا نەبووم.

ماڵئاواییان لێکردم. سەیرم کرد خێزانی مامۆستا دەستی کرد به جانتەکەمدا، ئەمەش خەسڵەتێکی تایبەته به خەڵکی ئەنادۆڵ، هەستم کرد شتێکی تێکردووە، دواتر سەیرم کرد بڕێك پارە و پارچه کاغەزێکی بچووکی تێدا بوو. لەسەر پارچه کاغەزەکه نوسرابوو:

(تۆ ئەمانەتی مەلەك خانیت، إن شاء الله تۆش دەبیته شیاوی بەهەشت. بیرت نەچێت ئامادەین له هەموو کێشه و نارەحەتییەکدا لەگەڵت بین، تۆمان زۆر خۆش ویست).

چاوەکانم پڕبووبوون له فرمێسك. ئێوه چەنده مرۆڤ دۆستن، ئایا پێویسته ئەوەنده به دەم خەڵکییەوە بن؟ بەدڵنیاییەوە توانیتان بەشێکی ژیانم داگیر بکەن. ئەو بەشەشم هەر لەوێ جێهێشت. هیوادارم ئەوەنده

پاك و دروست بم كه بتوانم جارێكی تر هەواڵتان بپرسم یاخود سەرتان لێبدەمەوە. بەڵام لەكوێ؟

ئەوانەی كۆمەڵگایان ژەهراوی كرد، ئەو كێوییانە لەكوێ پاكیزەیی منیان هێشت!... چیتر نەمدەتوانی لەم ماڵە پڕ لە ئاسودەیی و بەختەوەرییەدا بمێنمەوە، خۆم وەك دێوەزمەیەك دەهاتە پێش چاو، هیچ مافێكی ئەوەم نەبوو ئەو ماڵە درەوشاوەیە، ئەو كەشە پاكە چیتر چەپەڵ بكەم. لەبەرئەوە سەرەڕای داوای زۆریان ملی ڕێگەم گرتەبەر.

كەسێك بە دڵتەنگی ڕاهاتبێت تامی دڵخۆشی ناچێژێت. با ببینین دۆستە گیانی بەگیانییەكانم چ داوێكیان بۆ ناومەتەوە...

## لە ئەستەمبوڵ لە نێوان دژوارییەكی ناهەمواردا بووم..

ئەستەمبوڵ....

بەڵێ، ئیدی لە ئەستەمبوڵم. منی خوێنكاری كۆلێژی یاسا كە ئەندێشەی چاككردنی دنیام هەبوو و هۆگری ئاواتە بەرزەكان بووم، بە تەنیا و بێ كەس مابوومەوە.

ئەمینەی هاوڕێشم لە ئەنقەرە كۆلێژی پزیشكی بەدەست هێنابوو. دەزانم، داهاتووی ئەو پرشنگدارە. هەرچۆنێك بێت ئەو كچێكی ژیر بوو، دەركی بە مەترسییەكان دەكرد و دەیزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ دەورووبەری بكات، هەرچەندە بیر و بۆچوونەكانیشیم پێ پەسەندنەبوو. بەڵام ئەمە ڕاستییەكە، ئەی داهاتووی من؟

داهاتوویەكی تەماوی سەرتاپا ڕەش چاوەڕوانی دەكردم. تەنانەت ئەوەندەش پێشكەوتوخواز نەبووم كە خۆم هەڵكێشم و شانازی بەخۆمەوە

بکەم. هەرچەندەش بانگەشە و بانگەوازی بیری نوێ و سەردەمیانەم بکردایە... .

ئەمینە و خێزانەکەی پێداگری زۆریانکرد کە: "با لە جێگایەکی متمانە پێکراودا نیشتەجێت بکەین، ئەوێ ئەستەمبوڵە، هەموو لایەك پڕ مەترسییە بە تەنها تووشی گرفت و تەنگانە دێیت". ئەی وەڵامی من چی بوو: "نەخێر، من خۆم پاشەڕۆژی خۆم دیاری دەکەم. هێز و توانام دەسەلمێنم، نامەوێت کەس دەست وەربداتە کاروبارمەوە"

لە بەشی ناوخۆیی دەوڵەتدا جێگیر بووم. بەڵام وادیاربوو ناو و دەنگ و باسم پێش خۆم گەیشتبووە ئەوێ. ئەمجارەش چواردەورم بە چەندەها گەنجی بێئامانج و بێباك لە ژیان تەنرا. ئەمە لە یەکەم ڕۆژەوە ئاماژە و شەیپووری جەنگێکی تاقەت پڕوکێن بوو. مەگەر من چی بووم؟ نوێ خواز، ڕووناك بیر، ئازادی خواز، قارەمانێکی بێ وێنە؟ یان سۆزانییەك کە تا ڕادەی بەدبەختی کەوتبێتە دوای هەموو پیاوێکەوە؟

نا لەبەرئەوەی بەد نیازو، بیر گەنییو و پێشینەبڕیاربووم، تەنانەت ئەوانەی ڕووبەڕوویان دەبوومەوە هەربەوجۆرە بوون.

سەرەڕای هەموو پێشهاتەکان، مانگەکانی سەرەتا بە باشی هۆگری زانکۆ ببووم. وەلێ ئاستەنگەکان تا دەهات بەهێزتر دەبوون، تا ئەوەی وام لێهات سەرکەشانە بەلای ڕاست و چەپدا ڕۆیشتم. سەرەنجام وازم لە زانکۆ هێنا.

ئەو شوێنانەی کە بۆی دەچووم و گیرۆدەی بووبووم، ئەو ناوەندانە بوو کە گرووپە بەناو ئازادیخوازە بێ سەداکان لە ژێر ناوی چالاکی کۆمەڵایەتیدا کاری پیس و قێزەونیان تێدا ئەنجامدەدا.

شۆڕشگێڕان، مارکسییەکان، هیرۆینچییەکان و، نازانم چی تر... هەموو شوێنێکیان تەماوی و سەرەوژێر کرد، لەو نێوەندەشدا کچێکی لاو؛ ئەویش من، منێك کە سەبرۆکە سەبرۆکە کۆشکی ئامانج و بیرۆکەکانم بەرەو دارمان ملی دەنا و هەر لە سەرەتاوە هێز و ئیرادەم لە دەست دابوو.

بە هۆی کاریگەری ئەو گەنجە بێ ئامانجانە کە دەوریان دابووم، خۆم لە هەموو شتێك هەڵدەقورتاند. ئای خودایە ئەمە من بووم؟ ئادەی کوا ئامانج و بۆچوونەکانم، ئەی دنیایەك لە ئەندێشە وەنەوشەییەکانم؟ مەگەر لەبەرئەوە نەهاتبووم بۆ ئەستەمبوڵ ببمە یاساناسێك کە هەمووان دەخاتە سەر هێڵێك؟

مەگەر بڕیار نەبوو تۆڵە بکەمەوە لە وانەی جەستەی ژیانمیان زامدار کرد؟ بەڵێنەکانم چییان لێ هات؟

خۆم لەناو تەڵزگەیەکی ناپاکی و سوکایەتی ئەوتۆدا دەبینییەوە کە تەنانەت بەردەمی خۆشم نەدەبینی.

چ پێویستە بپرسن دۆڕاوی ئەم جەنگە دڵ پڕوکێنە کێ بوو؟

ئیدی من بووم کە وەك شڕە پەڕۆیەك لەملا بۆ ئەولا فڕێ دەدرام، مەگەر مانگە شەو سەر لە ئێوارە دیار نییە؟

لە ناو ئەچووم، بە هەموو شتێکەوە لەناو ئەچووم، لەناو زەلکاوێکی بێ بندا کە قوتار بوون لێی ئەستەم بوو، ڕۆنەچووم.

خەونی کۆلێژی یاسا لە کەناری ئاوابووندا بوو. تەنها شتێك کە دەمکرد سەرگەرمکردن لە گۆشەیەکدا و ڕۆچوونە نێو خەیاڵەوەو، دواتریش بوونە بەندەی بێ ئابڕوویەکی دووڕوو بوو؟

بەسە بەس، تا لەم کابووسە بە خەبەر دێم دەبێ چەندی تر بچێژم، دەبێ چەندی تر هێلانەی لە تان و پۆی جاڵجاڵۆکە چنراوی دڵم، بەرگەی ئەم نابووتیانە بگرێت؟

تا ئەوەی ڕاستییەکان ببینم دەبوایە چەندی تر لەو هەنگوینە بە ژەهر ناوپۆشکراوانەم بخواردایە؟ ئای نێچیری بەدبەختی ژێر چڕنووکی بێبەزەیی بێ ویژدانەکان!! ئاه...عەقڵم، ژیریم، کەسایەتیم، ناتانناسمەوە. ئیتر ئەوەندە بەسە.

ئەستەنبوڵ بە خێرایی قووتی دام، ئەوەی دەهاتە بەر دەمی بە زوویی چەپۆکی دارمانی لێدەدا. ناچار بووم کە بەشدارییان لەگەڵ بکەم، نە پارە، نە شوێنی مانەوە، تەنانەت نانێکیشم نەبوو بیخۆم.

دەك دارزێم بۆ چ مرۆڤێکم، قێز لە خۆم دەکەمەوە، بەڵام ئەم بارودۆخە بۆ هەندێك لە هاورێکانم هەر زۆر ئاسایی بوو. چ ژن چ پیاو پێویست بوو ژیانیان بە سەربەستی و، دوور لە هەموو پابەندبوون و ڕێسایەك بە سەر بەرن، ئەم جۆرە ژیانە نەسەربەستی و، نە ئەو جۆرە ژیانە بوو کە خۆم دەمویست. بەڵکو ئەوە زیندەگی دیلی و کۆیلایەتی بوو لە بەرگی ئازادی و یەکسانی ڕەهادا.

تاوان تاوانی من بوو، هەندێك جار سەرەڕای ئەوەی کە دەشمزانی ئەو کارانەی ئەنجامیان دەدەم هەڵەن، بەڵام هەر ئەنجامم دەدان. گەلێ جاری دیش بە دەستی خۆم دەرگاکانی ئومێدم بەڕووی خۆمدا دەبەست، خۆم دەمکرد و خۆیشم دەگریام.

چەند بوارێکی باش هاتنە بەر دەمم، بەڵام کەللەڕەقیم بەربەست بوو لە قۆستنەوەیان.

مرۆڤگەلێکی باشی وەك ئەمینە، باوکی، جەنابی ئیمام و، مامۆستای ماتماتیك لە ژیانمدا گوزەریان ئەکرد و، ئەوان منیان زۆر خۆشدەویست. دەیانویست بمپارێزن، ئامادەبوون یارمەتیم بدەن، ئەی من؟ من چیم کرد؟ ڕۆشنبیر، نوێخواز، نازانم چی، چاوم کوێر بێت، ئەمە دڕانێکی ئاشکرا بوو.

## ئا ئەمەیە ئازادی؟

## لە ئەستەنبوڵدا ئازاد بووم وانییە؟

هەرکە دەچیتە دەرەوە، چەندەها کەسی دووڕوو کە بە ڕووکەش هاوار و بانگەشەی ڕاستگۆیی و سەر ڕاستی دەکەن، کەیف و ئاسوودەییت تێك دەدەن، دەچمەوە زانکۆ! بەڵام زۆر دوواکەوتووم، تازە ناتوانم بێمەوە سەر خۆم!

لە بەشی ناوخۆیی جیا بوومەوە، پێویستە بچمە ماڵێکەوە (لەو ماڵانەی کە خوێندکارانی دەرەوەی شاری زانکۆ بە کرێ تیایدا دەمێننەوە)، بەڵام لە هەر ماڵێکدا پێویستە نرخ و بەرامبەری قورس و گران بدەم. هەڵبەت باجی مامەڵە و سەودای لەو جۆرە بەشێکی گەورە بوو لە ڕۆح و، پاکیزەیی بیر و بۆچوونەکانم.

ئا ئەوە بوو ئازادی؟ لە ناوچیێ ئازادی و سەربەستی لەو جۆرە. ئا ئیدی تۆ ئازاد نیت.

پشکی ئازادی ئەو گوندنشینەی کە سالآنی تەمەنی لەنێوەندی چوار دیواردا بەسەر دەبات، لەم ژینە بێ ئەرزش و بێزراوەی من زۆر زیاتر بوو.

ئایا ئەمینە یان جەنابی ئیمام لە بناری ئازادی و منیش لە ترۆپکەکەیدا دەشەکامەوە؟ من نوێخواز و ئەوان کۆنەپەرست بوون، وا نییە؟ ئەم ژیر پەرتییە لە کوێوە مێشکمی تەنی؟

له مێشکم دەرناچێت، نەمدەتوانی دەستبەرداری ئەو بیرە سەپاوانە ببم. کەشەکە بەشێوەیەکە کە ناتەوێت بیر بکەیتەوە، یان نابێت.

دەتەوێت مێشکت سڕکەیت، کەچی دیسان نابێت، دەڵێیت جارێکی تر نایکەمەوە، کەچی ڕێگە نادەن بۆ خۆت بیت، لە ناو ئازار و بێچارەییەکی جەرگ بڕدا دەتلامەوە، بۆ لەبیربردنەوەی خەم و دەردەکانم ئەفسانەیەك پێویست بوو. گەر بەم شێوەیە بڕۆشتایە کۆتایی ڕێگە زۆر نزیك بوو.

ڕۆژەکانم لە کوخ و، خانووە دارەکان و، گۆشە فەرامۆشکراوەکاندا بەسەر دەبرد. لەوێدا خۆم چاڵم بۆ خۆم هەڵدەکەند و کۆتایی ژیانم بۆ خۆم دەسازاند. ئیتر تاکە ڕێگەی نزیك بوونەوەم لە کۆتایی...

بە دوایشیدا ئەو ئازارە کەمەرشکێن و بۆشاییە ترسناکە.

لە بیرم دەچووەوە کە بۆچی دەژیم و، لە کوێم، خۆزگە هەرگیز بە ئاگا نەهاتمایەتەوە، ئیتر بەم شێوەیە کۆمەڵگا ڕزگاری دەبوو لە ناچیزەیەکی زیادە.

کە بێجگە لە بڵاوکردنەوەی میکرۆب هیچی تری نەدەکرد.

هەندێك جار لەکۆبوونەوەی هاوەڵە شۆڕشگێڕ و سەردەمییەکانمدا بەشداریم دەکرد. پێکەنینم دەهات بەو قسە بریق و باقە فریودەرانەی کە بە ناوی ئازادییەوە دەکران.

ئاه، ئەگەر ڕاستییەکان وەك دروشم و دەستە واژەکان دەبوون و لە سەر زەمین ڕەنگیان دەدایەوە!. "بەربەرەکانێی شەریفانە، ژیانی ڕەوا، مافی مرۆڤ، ..." بەڵێنگەلێکی چەند جوانن؟

ئەوجا بێنە ئەو ناپاکانەی کە ئەم دروشمانە ببووە بنێشتە خۆشەی سەر دەمیان، چۆن چۆنی ژیانمانیان پڕ ماتەم کرد.

هەروەك شرە پەڕۆیەك هەڵیان گرتبن و فڕێیان داین، ئیدی لەبەر ئەمەیە کە یاخی دەبم و دەمەوێت بە خۆ بێهۆشکردن ئازارەکانم لەیادکەم.

ساتەکانی ژیانم، ڕۆژو مانگ و ساڵەکانم هەموو ببوونە دۆزەخێکی هەڕەشە ئامێز کە هەر سات لەوەدا بوو بە بڵێسە پڕ نەفرینەکانی ختووکەی خوێناوی جەستەی شەکەت و ماندووم بدات و قاقای مەرگم پێ بنوێنێت.

لە تاو ئازاری ئەو ڕۆژانە هەر خۆم دەخواردەوە، جا ئەو نا ئومێدییە دوا بڕاوە! ئەی ئەو تابلۆ سەرتاپا ڕەشەی داهاتوو کە بەتەواوەتی تاقەتی پڕوکاندبووم، بەرگە گرتن چ گونجاو بوو! . هەرچۆنێك بێت چوومە قۆناغی دوو و پێمان نایە هاوینەوە. دەیەها بانگهێشتی ئەمینەم ڕەتکردەوە. چەندەها جاریش هاوسەری جەنابی ئیمام و مامۆستای ماتماتیك، پەیوەندییان پێوەکردم.

نا، نا... وازم لێبێنن، ئەوەی خێربێت لەمندا نییە.

کاتێك لەگەڵیاندا دەدوام هەستم بە بارخراپی زیاتر و بێزاری زۆرتر دەکرد.

دڵسۆزی و دروستی ئەمینەو، ڕەفتاری باوك ئاسای مامۆستای ماتماتیکم و زوو زوو هەواڵ پرسینم، "زۆر بیرت دەکەین" و چەندەها پەیڤی هەنگوینی لەم شێوەیەی هاوسەری جەنابی مامۆستا، هەروەك بڵێی پشکۆیەك بوو و دڵەی سووتاومی دەکولاندەوە.

کە ئەم مرۆڤە چاکانەم دەبینی، یان گوێم لێدەگرتن، گێژەلۆکەی کێشمان کێشێکی بێناونیشان لەدەروونمدا هەڵیدەکرد.

ئەمە جۆرە هەستێکی لەخۆپرسینەوە بوو، ئەمە زایەڵەی هاواری ویژدانێکی تەریزی وێڵ بوو کە بەهۆی کردەوەکانمەوە تاوانباری دەکردم و

بەرۆکی بەئاگاهاتنەوەمی ڕادەوەشاندم. هەر کە گوێم لەو دەنگە دەبوو، ئارەزووم دەکرد خۆم لەت و پەت بکردایە.

بۆچی ئەوەندە خراپم، ئاخر بۆ؟ بۆچی بەهیچ شێوەیەك خۆم نادۆزمەوە؟ ئیتر لەبەر ئەمە بوو کە نەمدەویست لەگەڵ ئەو مرۆڤانەدا ڕووبەڕووببمەوە، هەربۆیە لەدەستیان هەڵدەهاتم.

بەڵێ، سەد مەخابن ئەمە ڕاستییەکە بوو، باشترین شت ئەوە بوو جارێکی تر نەیانبینمەوە، ئیدی تاکە شتێك کە دەبووە مایەی (یان من وام دەزانی) ڕەوینەوەی ئازار و نسکۆکانم، ئالوودە بوون بوو بە ماددە سڕکەرەکان. هەڵبەتە نرخ و باجی ئەمەش زۆر گرانە، سەرەنجام شتێك نییە لە یادی بکەم، ئاسوودەییش کە هیچ، بەڵام خاك بەسەر خۆم، تەواو پێچەوانە بوو، داخ و کەسەرەکانم ئەوەندەی تر زیاد بوون.

سەرلەنوێ ژوورەکەم پڕ بوو لە بەروانکە سپییەکان. دووانیان دکتۆر و دوانەکەی تریش پەرستار. ئەنجامەکان تاووتوێ دەکەن. لەچاویاندا ئاماژەی بێ ئومێدی دەخوێنرێتەوە، زەردەخەنە دەستکردەکان ئەناسمەوە. ئیشەکان بەتەواوەتی ئاڵۆسکاون، بابەس بێت، ئای تەمەنی ماندوو و بێ ئۆقرەم، جا چیت نەچەشت!.

ئەنجامەکان زۆر خراپ دێنەوە، بەڵام نیگەران نیم. ڕەنگە سەرئەنجامە خراپەکان هیچ کاریگەرییەکیان نەبێت لەسەر یەکێك کە بڕیاری مەرگی داوە، یان من وا گومان دەبەم.

کەمێك پشوو دەدەم، کە چواردەورم چۆڵ بوو، دەست دەکەمەوە بەنووسین.

## بەها کەسییەکانم بوونە سفر

شـوومم کـرد، بـەڵام ئـەو گەنجـەی کـە بوومـە هاوسـەری خـاوەنی کەسایەتییەکی لە خۆم لاوازتر بوو. هیچ شتێکی بە خەیاڵدا نەدەهات. هیچ ئەرزشێکی بۆ پیرۆزی هاوسەرگیری و هەستی لێپرسراوێتی دانەدەنا، نەك ئەوە بەڵکو هەر لەبنەڕەتەوە باوەڕی پێی نەبوو.

لە ماڵەوە ئەو هەروەك هەرزەیەکی سەرشـەقام و منـیش وەك کیـژێکی تۆراو لە سروشتی ناسکی هاوسەرێتی مامەڵەمان دەکرد.

مەگـەر هـەردووکمان پـەروەردەی ئـامێزی بێبـەزەیی بـیره چـەوتەکان نەبووین؟! بێ گومان ئەم بارەش گورزی کەمەرشکێنی لـە جیهـانی ڕۆحـم دەدا.

تا ئێستاش لە قوڵاییەکانی ڕۆحمدا هەست بـە بـوونی بەرەیـەك ئەکـەم کە بەرهەڵستی ئەو حاڵەتە دەکات.

جا تۆ بڵێی ڕۆژێ بێت ئەم جەستەیە هێـز بـە دەسـت بهـێنێ و ڕزگـارم بکات؟ زۆر ئەستەمە، ئەستەم...

بەردەوام نەبوون و شکستی ئـەم هاوسـەرگیرییە لای هـەموان ئاشـکرا بوو. هەرواش بوو، نەمتوانی شەرەف و ناموسی خۆم بپارێزم، بۆ ئـەوەی چەمکی خێزانیش مانا پاکە دڵفرێنەکـەی لـە دەسـت نـەدات بـەزوویی جیـا بوومەوە. بەڵام بۆ کوێ، بۆ لای کێ دەڕۆیشتم؟

وام لێهـاتبوو خـۆمم نەدەناسـییەوە، هـەروەك بڵێـی لـە ناخمـدا دوو کەسایەتی هەبێت و هەریەکەشیان لەگەڵ ئەوی تردا لـە دەسـتە و یەخـەدا بێـت. ئـەو منـەی کـە ئەمینـەو، جـەنابی ئیمـام و، مامۆسـتای ماتماتیـك دەیانویسـت کۆمـەکی و پشـتیوانی لێ بکـەن؛ لەگـەڵ ئـەو منـەی خـۆی خزاندبووە سووچی شەقامەکانی ئەستەمبوڵ و لەنێو سەرسەرییەکانیدا لـە

دووی سـەرابی کامـەرانی هەناسـەبڕکێی بـوو. دووکەسـایەتی زۆر جیـاواز بەرامبەر یەکتر دەجەنگان، بەڵام ئاشکرایە کـە بـەرەی ئەسـتەمبوڵ بـراوە بوو. ئەو ڕۆژەی لە مێردەکەم جیا بوومـەوە، بـەرەو (بـەی ئـۆوڵ) کەوتمـە ڕێ. مەبەسـتی ڕۆیشـتنم بـۆ ئـەوێ داواکردنـی مـادەی سـڕکەر بـوو لـە هاوڕێیەکم بۆ ئەوەی ڕزگارم بێت لـەو ئـازارەی کـە وەك بۆمبایـەك خـەریك بوو مێشکی دەتەقاند.

ناخم زۆر پـڕ بـوو، ئـاخر کچێکی تـەنیای کەرامـەت ڕوشـێنراو لـە کـام دەرگای ئومێدی بدایـە، هانـای بێـدەرەتانی بـۆلای چ ویـژدانێك ببردایـە؟! گەر شتێکم دەست نەکەوتایە دوورنەبوو تووشی سەکتەی دڵ ببومایە. ئەم خووە نەفرینە هیچ شتێك نابیستێت و دان بەخۆداگرتن ناناسێت.

لەو کاتەدا کە لە وێستگەیەکی پاسدا چاوەڕوانیم دەکـرد، هەسـتم کـرد دەنگێکی ناسراو بانگم دەکات:

– کچم، ئایسێل..

بە گومانەوە ڕووەو ئاڕاستەی دەنگەکە ئاوڕم دایـەوە، ئـاه کـێ ببیـنم، خێزانی جەنابی ئیمام.

هەرچۆنێك بێت هێزم دایە بەرخۆم و وتم:

– ئێوە بەدوای چیدا دەگەڕێن. باوەشـی پێـدا کـردم و گۆناکـانی مـاچ کـردم. دوا هـەوڵی خـۆم دا تاجەسـتـەی بـە زۆر وەسـتاوم کـۆ بکەمـەوە، جەنابی ئیمامیش کـە کـەمێك لـەولا تـرەوە وەسـتا بـوو حـاڵ و ئـەحواڵی پرسی.

ئەی خوایـە، ڕێـك لـەو کاتـەدا کـە دەمویسـت خـۆم فڕێدەمـە باوەشـی بێهۆشییەوە کێم بوو بە تووشەوە! بەڕاستی چاوەڕوان نەکراو بوو.

– ئێمە ئەچین بۆ ئوتێل، گەر بوارت هەیە وەرە، ئەمشەو پێکەوە دەبین.

نەمتوانی ملە جیڕەیەك بکەم، لە ڕاستیدا ئەمویست بەرهەڵستی بکەم و نەڕۆم، بەلاّم هێزێك لە ناخمەوە پاڵی پێوەدەنام کە لەگەڵیان بڕۆم. بەو پێیەی شوێنێکی ترم نەبوو لێی بمێنمەوە، وتم با هیچ نەبێ ئەمشەو کەمێ بخەوم. هەڵبەتە گەر تەندروستیم ڕێگەی بدایە. لەرزۆك لەرزۆك لەگەڵیاندا کەوتمە ڕێ.

هاوسەری جەنابی ئیمام بێدەنگییەکەی شکاند و وتی:

– جەنابی ئیمام بۆ بەدەست هێنانی بڕوانامەی خوێندنی بالاّ (ماستەر) دەخوێنێت و ، تاقیکردنەوەی هەیە. منیش کەمێك ناساغ بووم هاتووم تا پشکنینی پزیشکی ئەنجام بدەم.

کەواتە جەنابی ئیمام بۆ ماستەر دەخوێنێت، وای! ئەمە ئیمامی لادێ و تەماشای منیش بکە! هەر لەبەر ئەمە بوو کە نەمدەتوانی خۆڕاگر بم. دەبوایە پیرۆزباییم لێ بکردایە. چی بکەم، لە ژیانمدا پێشڕەوێکی وام نەبوو. هەموو ئەو وێنە و کەسایەتییانەی کە دەمویست شوێن پێیان هەڵبگرم لە بەرەی فکر و ئایدۆلۆژیای بەرامبەر بوون.

جەنابی ئیمام پرسی: کچم لەگەڵ زانکۆدا چۆنیت ؟

گەر بە زۆریش بوایە، دەبوایە شتێکم بووتایە.

– ئەمساڵ لە قۆناغی دووەمم، کەمێك گرانە، بەلاّم هەرچۆنێك بێت چارەی دەکەم.

– مامۆستاکانت چاك دەناسم، هەر ئەوانیش مامۆستای من بوون. وانەکانی خوێندنی بالاّ هەر لای ئەوان دەخوێنم، ئێستاش بڕوانامەکەم لە تەواوبووندایە. خوا یار بێت بۆ بڕوانامەی دکتۆرا ئامادەگی دەکەم. کە

دکتۆراکەم بە دەست هێنا، لە پلانمدایە بچمە ئەنجوومەنی فێرکارانەوە و ببمە مامۆستای کۆلێژی یاسا. وانەکانم زۆر باشە و بالاترین نمرەم هەیە، گرنگی پێدانی مامۆستا بەرێزەکانیشم هیوا بەخشە. تۆش لە هەوڵ و کۆششدابەو زانکۆ تەواو بکە، بۆ خوێندنی بالاش هاوکارت دەبین، مامۆستاکانم لەم بابەتەدا رێ ئاسانکەر دەبن.

بێ دەنگ بووم...

لە بەرامبەر چاکەی ئەم مرۆڤانەوە چۆن خۆم ڕاگرتایە؟ نازانم چۆن دەمتوانی لەبەردەم میهر و سنگ فراوانی ئەو کەسانەدا نەبمە دێوانە.

تێنەدەگەیشتم کە بۆچی ئاوا یارمەتی کچێکی کۆتا هاتووی تەمەن بە فیڕۆچوو دەدەن؟

ئیدی لە قولاییەکانی ناخمەوە بمناسن، بۆ ئەوەی بزانن کە من کچی سەرشەقامە ئابڕوویەرەکانم و وەك ئەوەی هەم بمناسن، دەبێت چی بکەم بۆئەوەی تێبگەن، بەلام ئەوان پەرۆای ترۆسکاییەکی چاکبوون کە خۆشم نەمدەزانی.

شەو لە ئوتێلەکە پێکەوەبووین. ئەم جارەش وەك جاری یەکەم گەیشتنەوەم پێیان وەك سروەیەکی ئاسوودەهێن، کە بە شەرمەوە ختوکەی بەرەبەیانییەکی تۆراوی دەدا، دڵمی گەشاندەوە.

بۆ ساتێکیش بێت، هەموو ئەو شەپۆلە بەسوێ و درندانەی کە دەوریان دابووم ڕەوینەوە، بیرم لە هەموو خەونە تاڵەکان سڕایەوە. دەتوت کەوتوومەتە نێو ئەفسوونی دوو فریشتەوە. نە سەرنێشە نە ئالودەی ماددە سڕکەرەکان نەمان، خۆشم نەمدەزانی چییە، سەرسام مابووم.

کەواتە مرۆڤە دیندارەکان خاوەنی هەرێم و مەملەکەتی کامەرانی و ئاسودەیی تایبەت بە خۆیانن، بە نووری خۆشەویستییان بە وێنەی خۆر

دەروونە تاریکەکان ئاوەدان دەکەنەوە و بە گەرمی دڵسۆزیشییان دڵە شەختە سەهۆڵ ئاساکان دەکەنە کەوسەری ژیان.

لە پرێکدا بروسکەی بیرکردنەوەیەك لە ئاسمانی ئەندێشەمدا چەخماخەی دا، گەر لەگەڵ ئەم کەسانەدا بڕۆمە گوندەکەی خۆمان، لە خانۆچکە وێرانەکەمدا بە تەنها بژیامایە دڵخۆش نەدەبووم؟ خۆ لەوێ چەتەکانی ئاسودەیی و ئەو مرۆڤە ناپاکانەی لێ نیە کە چواردەوریان تەنیبووم.

"تکایە لەگەڵ خۆتاندا بمبەن، با لە نێو چیاکاندا ژیانێکی بێناونیشانی تەنها بەسەربەرم. بە پشیلە، سەگ، گوێ درێژەکانی ڕازیم. بەس لە چنگی بێبەزەیی ئەم دڕندانە ڕزگارم کەن. سا بەڵکو تەوبە بکەم و ببمە کەسێکی تەوبەخواز، ئەوساش ئەو کیژە دیندارەی کە دایکم ئاواتی دەخواست بێتە سەرشانۆی ژیان، یاخود کەسێك بەم ماڵ و بارەوە پێم ڕازیبێت و بێتە خوازبێنیم، ئیتر منالم دەبێت و هەستی پاك و پیرۆزی دایکایەتی لە ناخمدا هەڵدەقوڵێت".

وادیارە لەبەرخۆمەوە قسەم دەکرد، چونکە هاوسەری ئیمام بانگی کردم و وتی: "ئایسێل گیان شتێکت وت..."

- نەخێر تەنها کەوتبوومە ناو خەیاڵەوە ...

ئەوشەوە لە ئوتێلەکەدا میوانداریان کردم، هەم جەنابی ئیمام، هەم هاوسەرە میهرەبانەکەی زۆر ئامۆژگارییان کردم و چەند ڕاستییەکیان بۆ ڕوون کردمەوە، بەڵام ئەو مێشکە کوا کە گوێبیستی ئەو ڕێنومایانە بێت و پیادەیان بکات، سەرەڕای ئەمە بەتەواوەتی باوەڕم پەیداکرد سەبارەت بەوەی گەر لای ئەم خێزانە بەڕێزە دڵسۆزە بمامایەتەوە، ئەوا دڵخۆش دەبووم. وەلێ بەختێکی لەو جۆرە لە کوێ و من لە کوێ؟

سەرئەنجام ئەستەنبوڵ قووتی دام، ناچاربووم کە لە سێیەمین قۆناغی زانکۆدا لە خوێندن دابېرێم، بەهۆی تۆمەتی ماددە بێهۆشکەرەکانەوە لەلایەن پۆلیس و دەزگاکانی پاراستنی ئاسایشەوە تووشی بێنە و بەردە و لێپرسینەوە بووم.

چەند شوویەك، جیابوونەوە بە دوایاندا... هەر لە سەرەتاوە چارەنووسیان دیاربوو. قۆناغی دووەم زۆرتر لە بڕگەیەکی خنکاوی شانۆیەکی بێ ویژدان دەچوو، کە پاڵەوانەکەی من بووم، چ پاڵەوانێك، شمشێرەکەی گریان و، ورەی ڕووخاو و هەنگاوەکانیشی پڕ لە گومان و بێ متمانەیی. ژیانم تا بڵێی ئاڵۆسکابوو، دەرگاکانی ئومێد هەر زوو بەڕوومدا داخران، لەو ئەستەنبوڵە گەورەیەدا بێ جێگە و لانە مابووم، خەرجیش کە باسی نییە، بڕوانن بە کوێ گەیشتووم. ئەوەندە پەرێشان و زەبوون بووم کە تەنانەت نەمدەتوانی لە بیری چارەدۆزێکدا بم، هەرگیز ناتوانم بیگێڕمەوە. من کچی ئەو ڕۆژە قێزەونانەم کە تەنانەت نامەوێ بە ئەندێشەش بە لایاندا ڕەتبم. هەموو ئەم ناکامە ناکامانە سەرەنجامی نەبوونی یان نەسازاندنی ژینگەیەکی باش و گوێڕایەڵی نەکردنی ئامۆژگاری کەسە ژیر و دڵسۆزەکان بوو.

لە برسانا لەبەردەم مارکێتێکدا بورامەوە، دوایەمین شتێك کە لە بیرم بێت، گەڕانم بوو بە شوێن پارچە نانێکدا تا سکم تێربکا.

چاوەکانم لە کلینیکێکی پزیشکیدا کردەوە. پزیشکێك کە بە چاوە گەورەکانی بۆی دەڕوانیم و لە تەنیشتیشیدا پیرە پیاوێکم بینی. جێگەی مۆربوونەوەی دەرزییە بێهۆشکەرەکان ئاماژەیان دەکرد بۆ ئەوەی کە چ کچێك بووم. تەمەنم هێشتا بیست و دوو ساڵ بوو. ڕەنگی بزرکاو و جەستەی شەکەتم زۆر زیاتر لەوەیان دەنواند. دکتۆرەکە هەڵیساندم:

"گرفتێکی ترسناك لە ئارادایە گەر لەم خووە زیانبەخشە دەست هەڵنەگریت، دڵنیابە کە ژیان بەزەیی پیاتا نایەتەوە، بێگومان گەر بەمە بڵێین "ژیان".

جگە لەمە چەند شیکارییەکی سەرەتایی خوێنمان بۆ ئەنجامدایت ژیانت لە ژێر مەترسییەکی گەورەدایە، گەر بە زوویی هەنگاو نەنرێت ئەوا ڕۆژانێکی سەخت چاوەڕێتە. دەبێت بێیتەوە سەر خۆت و ئاگاداری وردی تەندروستیت بیت". گەلێ ئامۆژگاری تریش ... تا توانی قسەی بۆ کردم، مرۆڤێکی باش بوو. ڕێنوومایی زۆری کردم.

## بۆ ئەوەی بە برسێتی نەمێنمەوە شووم کرد بە پیرە پیاوێك...

پیاوە پیرەکەی تەنیشتم گەیاندبوومیە نەخۆشخانە، ئەم پیاوە دانیشتووی گەڕەکی "ئەیووب" بوو و بە تەنیا دەژیا، دوو ساڵ لەوەوبەر ژنەکەی مردبوو. منداڵەکانیشی لە دەرەوەی وڵات بوون.

خێری بنووسێت یارمەتیدام، لە ئاوا بارێکی گراندا ڕووبەڕووی مرۆڤێکی ئاوا بوومەوە، بەڵام ئەم جارە خۆم یەك لایی کردبۆوە. نیازم نەبوو دەستبەرداری ئەم پیاوە ببم، چونکە بێچارە بووم. ئاتاجی کەسێك بووم بمباتە لانەیەکی گەرم و گوڕەوە.

توانای خۆکەشخەیی و سەرپشکی هەڵبژاردنی کەسێك یان ڕەتکردنەوەیم نەمابوو. بە خۆمم دەوت هەرکەسێك بێت بەس ئەوەندە لە بێنەوایی و پەژموردەیی قوتارم بکات.

هەرچۆنێك بوو ڕازی بوو بەوەی زەماوەندم لەگەڵ بکات، جا بۆ ئەوەی درۆزن دەرنەچم هەر لە سەرەتاوە هەموو شتێکم بۆ باس کرد، ئینجا بۆ

ئەوەی باوەڕم پێبکات چووین بۆ مزگەوتی (ئەیووب سوڵتان) و لەوێدا تەوبەم کرد.

ئەمە چ ڕووداوێکە؟ کچێکی بێ باوەڕ لەگەڵ کەسێکی دینداردا زەماوەند دەکات؟ منێکی بیست و دوو ساڵ و پیرێکی شەست ساڵانە. بۆ ئەوەی بێمەوە سەرخۆم دەبوایە بەڕێکوپێکی و پارێزکارانە هەڵسووکەتم بکردایە. تەنانەت سەریشم داپۆشی، کچە بێ باوەڕە نوێخوازەکە گەڕاوەتەوە؟ جا کێ باوەڕی بەمە دەکرد؟

ئیدی بەخت یاوەری پیرەپیاوەکە بوو، هەچۆنێك بێت سەرەنجام بێ باوەڕێکی هێنابووە سەر ڕێی ڕاست و خانمێکی لاویش هاتبووە ژیانییەوە. ئەو سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە ژیان، لە هەڵە و ناتەواوییەکان ڕزگاری ببوو، یان لایەنی کەم وا گومانی دەبرد.

دەی با وا بێت، گرنگ ئەوە بوو ماڵێك هەبوو کە داڵدەم بدات. ئەی دواتر؟ ناتوانم نکوڵی چاکەکانی بکەم. بە سۆز و میهرێکی زۆرەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردم. لە سەرەتادا شەش مانگ خرامە ژێر چارەسەری مادده سڕکەرەکانەوە، هێندەی نەمابوو چاکببمەوە کە کارەساتێکی تر بەرۆکی گرتمەوە، نەخۆشی جگەر، بەدوایشیدا شێرپەنجەی جگەر، ئای کە بە سوێیە، تا ماوەیەکی درێژ مەسەلەی شێرپەنجەکەیان لێشاردمەوە، بەڵام سەرەنجام پێمزانی، ئای خورپەیەکی چەند بە ئازار بوو، هەواڵێکی چەندە دەروون هەژێن بوو. لە ساتێکدا هەموو دنیا لەبەر چاوم پەردەی ڕەشی بەسەردا درایەوە، نسکۆ و بەلاکانی ڕابردووی بە جارێك یادهێنامەوە، ئاسان نەبوو، ئەمە بارێك نەبوو بتوانم لە ژێریدا بێمەدەرەوە، ئەمە هەواڵی مەرگێکی حەتمی هێواش بوو. ئەم نەخۆشییەشم هەمووی ئاکامی مەی و، جگەرە و، مادده سڕکەرەکان بوو.

جا وەرە بەرگەی بگرە، بەدەستی خۆم گۆڕم بۆ خۆم هەڵکەند. مێردە پیرەکەم هەوڵی چارەسەرکردنی دەدام، تەنانەت چەند جارێکیش پێشهاتی موعجیزە ئاسا ڕوویدا کە ئاماژە بوون بۆ ئەوەی سەر لە نوێ گەڕابوومەوە بۆ باری تەندروستی جاران. ڕێك لەم کاتەدا بەلەمی تازە لەنگەرگرتووی ژیانم ڕووبەڕووی زریانێکی دژواری تر هاتەوە و زامەکانم هێندەی تر قووڵبوونەوە، بە هۆی سەکتەی دڵەوە مێردە پیرەکەم ژیانی لەدەستدا. ئای خوایە ئازار لەسەر ئازار، فەلاکەت لەسەر فەلاکەت، ئەمە ژیانە یان خەونێکی ناخۆش؟ خوالێخۆشبوو مووچەی خانەنشینیەکەی بۆ بەجێ هێشتم و بە بیمە تەندروستییەکەی بەردەوامیمدا بە چارەسەرەکەم.

بەڵام زۆری نەخایاند، منداڵەکانی لەدەرەوەی وڵات هاتنەوە، خانووەکەیان لێسەندمەوە و دەریان کردمە دەرەوە.

بە بۆچوونی ئەوان ژنێکی بەدڕەوشت باوکیانی فریوو دابوو.

دەك بە ڕەحمەت چێت، هەرچۆنێك بێت چارەسەری کردم و مووچە و بیمەی تەندروستییەکەی بۆ جێهێشتم. ئەمە بۆ ئافرەتێکی تەنیای نێو ئەستەنبوڵ کەم نەبوو.

ئای بەدبەختیم! ئەوەندەی نەمابوو بگەمە تەختانی و لە نشێوی و هەڵبەز و دابەز ڕزگارم بێت، هاوسەرێك بە وێنەی باوك کۆمەکی دەکردم، ورەیەکی ئەوتۆشم پەیدا کردبوو کە خەریك بوو نەخۆشییەکەمم دەبەزاند. هۆشم هاتبوەوە و بڕیارمدابوو کە هەر لە نەخۆشخانە هاتمە دەرەوە یەکسەر چاکسازی خۆم بکەم و لاپەڕەیەکی نوێ لە ژیانم هەڵبدەمەوە. واتە داخوازی و ئاواتەکانی ئەمینە و جەنابی ئیمامم بەجێ دەهێنا. پێشم وابوو بەم تەرزە بە ژیانێکی کامەران و ئاسوودە شاد دەبووم. وەلێ مەخابن، پەتەکان پسان، پردەکان داڕمان، سەرلە نوێ شەمەندەفەری

ژیانێکی خۆش وەستا و دووبارە خۆمم لە هەمان کۆنە وێستگەی ژانی مانەوەدا دیتەوە. کەوتمەوە ناو هەمان باری جاری جاران و چواردەوریشم هەمان کەسانی بێ ویژدان، ئاسۆکان وایان دەنواند کە ڕێگەی ئەم جارە بێ گەڕانەوەیە. شەقامێکی کوێرەوە بوو چاوەڕێی دەکردم. خۆشم نازانم چەند ڕۆژ بەبێ ئامانج و هۆ بەتاڵ بەتاڵ لەم بیابانە ساردەدا سووڕامەوە.

دوایین شت کە بیزانم، لە هۆشخۆچوونم بوو لە ناوەڕاستی شەقامێکدا، جا نازانم ئایا بەهۆی برسێتییەوە بوو کە کەوتبووم یان لەتاو نەخۆشی. بە بۆچوونی من بە هۆی برسێتی و، "پەرەسەندنی نەخۆشییەکە"شم ڕای پزیشکەکان بوو.

هەروەك وتم مێردی ڕەحمەتیم مووچەی هەبوو، بەڵام ئەو برە پارەیە چۆن بەشی کەسێکی دەکرد کە تەمەنی لە زەلکاوەکانی بێ دینیدا بەسەر بردووە و لیتاوی گوناه گەیشتوەتە بینەقاقای. لە یەکێك لە نەخۆشخانەکاندا کەمێك چارەسەرم دی، بەڵام بەرگەی ئەو ئەشکەنجەیەم نەدەگرت هەربۆیە دەرفەتم لە ماوەی دیدەنییەك وەرگرت و هەڵهاتم. ئەم مێشکە نیازی چاکبوونەوەی نەبوو یاخود بەتەواوی هاوسەنگی لە دەست دابوو و نەیدەزانی کە چی دەکات.

بە ئومێدێکی کزەوە هاتم بۆ ئەنقەرە، بەڵام هیچ کەس دەرگای بە ڕوومدا واڵا نەکرد. زۆر بێچارە و دڵشکاوبووم. هەموو هێز و توانام لەدەست دابوو، دەردەکەشم ئەوەندە گران ببوو لەسەر پێ خۆم ڕانەدەگرت. کە دەڕۆیشتم خۆم ڕادەکێشا، قاچەکانم لەگەڵمدا نەدەهاتن. هەر ڕۆژێکی نوێ، ئەوەی دوێنێی لا خۆشەویست دەکردم و خۆزگەی ڕابردووی پێ دەخواستم. نیگا ترسنۆکەکانیشم هەر بەدووی ڕابردووە

بێنازەکەمەوە هەناسەبڕکێیان بوو. بەڵێ، لە نێو هەڵە و سەرگەردانیدا دەگەوزام، بەڵکو تا ئەو ڕۆژە هیچ خۆمم بە هەڵە نەزانیبوو.

بێ باوەڕی، نوێخوازی و چەندەها ڕەزالەتی تر. بەرەو ئامانجێکی کۆتا نادیار ملم دەنا، زۆر کەللەڕەقبووم. گەر ڕاستییەکان بیری من نەبووایە قبوڵم نەدەکرد، هەڵبەتە "ڕاستییەکان" تەنها ئەوانە نەبوون کە من دەمزانی، بەڵکو ڕاستیگەلێکی دیش لە ئارادا بوون کە من زۆر زۆر لێیانەوە دوور بووم، ئیتر ئەمە گەورەترین هەڵە بوو کە کردم. پشتیوانییەکی سەختم لە ناهەقییەك دەکرد کە خۆم بە ڕاستم دادەنا، یان ئاوها تێیانگەیاندبووم. هەر لەبەر ئەمە کونێك نەما سەری پێدا نەکەم، گشت جارێکیش شکست و دۆڕان... کەچی پەندم وەرنەدەگرت و بێدار نەدەبوومەوە.

# بەشی چوارەم

## ڕۆژانی نەخۆشخانەم

### کە تیایاندا چاوەڕوانی مەرگ بووم...



**پوختەی ئەم بەشە:**

هەموو شتێکم لە دەست دابوو، ئیتر ژیان بۆ من مانایەکی نەمابوو. من زیادەیەکی تاوانبار و گوناهکار بووم بەسەر ئەم کۆمەڵگایەوە. تەنها ئارەزووم ئەوە بوو کە هەرچی زووترە ئەم ژیانەم کۆتایی بێت.

چەندین جار هەوڵی خۆکوشتنم دا، بەڵام نەمتوانی.

تەنها ویست و ئارەزووم لە ئێستادا ئەوەیە کە ئەم نەخۆشییە بێ ئامانەم بمکوژێت و منیش لە زەحمەتی خۆکوژی ڕزگار بکات. بەڵام تەماشای ئەم بارودۆخە بکەن، لەکاتێکدا کە من بە حەسرەتەوە چاوەڕوانی مەرگ دەکەم، لەو لاوە چەندین ڕووداو ڕیزیان بەستووە کە هەرگیز جێی بڕوا نین...

# ئەی ئەگەر هەبوو؟

ژیانم هەر ژان بوو، بەلاّم ئەم جارەیان زۆر تووڕەترو بێ بەزەیی تر. چاوەکانم لە بەشی خزمەتگوزاری ئۆنکۆلۆجی(شێرپەنجە)ی نەخۆشخانەیەکی گەورەدا کردەوە، ئەم گەمەیە لە تەواوبووندا بوو. زۆر سوپاس بۆ نەخۆشییەکەم، لە نارەحەتی خۆکوشتن ڕزگاری کردم.

ئیتر لە نەخۆشخانەکەدام، واتە لەسەر جێگەی مەرگ. مردنم دەبینی. هەروەك بڵێی کەمێك لەولاتر چاوەڕوانی دەکردم.

پێدەچێت نامە نووسین و ڕەشکردنەوەی ئەم دێڕانە لە دوای ئەم ساتەوە، "تا ئەوەی یەکێك دەنگم ببیستێت"، بە ناجۆرو بێ مانا بێتە بەرچاو، تەنانەت خۆشم نازانم بۆچی دەینووسم.

بەلاّم لەوانەیە هۆکاری نووسینی ئەم نامەیە، هەستێکی پڕ لە نەفرین، ناڵەی خۆم، یا کسپەی "من کردم، دەخیل ئێوە نەیکەن"ە. یاخود خۆ دڵخۆشکردنێك، سێبەری دەردەدڵێك یا نزاو پاڕانەوە یەك بێت.

نازانم، وەلێ دڵنیام لەوەی کە ئەمە پەیڤێکە بۆ نەوەکانی داهاتوو. دواین هەناسەی ویژدانێکی زامدارە ڕووەو ئەو گەنجانەی لەودیو پەردەی سەدەکانی دواترەوە بە ئەسپایی خۆیان ماتداوە. با کیژە لاوەکان ئەم

بەسەرهاتەی من زۆر باش بخوێننەوە، بزانن ئەوتەڵەو فێڵانەی کە منیان کەساس و بێچارەکرد هێشتا ماون و ڕاوچی مرۆڤەکانیش لە بۆسەدان.

لە دەمی نووسینی ئەم نامەیەدا هێزێکی باوەڕپێنەکراوم بە خۆمەوە دیت، هەر وەك بڵێی بۆ نووسینی ئەم نامەیە توانستێکی تایبەتیم پێبەخشرابێت.

ئەمە وزەیەك بوو بۆ سەر لەنوێ ژیانەوە، دوایەمین دەرفەتی دانپێدانان بوو لە بەردەم دادگای ویژداندا......

دووەم ڕۆژی نووسینی نامەکەمە. لە سەرەتادا وام بە خەیاڵدا هات کە لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا تەواوی بکەم، بەڵام وا نەبوو.

جۆرە هەستێکی تایبەتی لە دەروونمدا شکۆفەی کرد، چاوم لە نێوەندی ڕەهەندێکی تردا کردەوە. لە سەرەتادا مەبەستم لەم نووسینە داخ ڕشتن و دابارانـدنی ڕق و نەفرینم بوو بەسەر ئەوانەی خونچەی ژیانمیان هەر بە زوویی ژاکاند، کەچی لەماوەی ئەم دوو ڕۆژەدا کە سەرقاڵی ئەم نامەیەم، بە بێ ویستی خۆم ڕاڤەی ژیانم دەکەم.

ڕاستی و چەوتییەکانم لەپاڵ یەکدا دانا، بە مانایەکی تر لێپێچینەوە لەگەڵ خۆم دەکەم. ئەکرێت بڵێم هەڵسەنگاندنێکی گشتی ژیانم بوو. کۆمەڵێك وردەکاری ئەوتۆم بۆ ڕوونبووەوە کە هەرگیز بیرم لێنەکردبوەوە، تەنانەت بە ئەندێشەشمدا گوزەری نەکردبوو. گرنگترین و هەستیارترینی ئەو بابەتانەش، ئەو باوەڕە چەوتە دواکەوتووە بوو کە نەمدەویست دانبنێم بەوەی کە گەردوون و مرۆڤ بەدیهێنەرێکی هەیە. هەر کات ئەم بابەتە بە مێشکمدا بهاتایە بە "نییە" دەمبڕاندەوەو لە کۆڵ خۆمم دەکردەوە، هەنووکە بووەتە ماخۆلانی مێشکم و ئاوەز و ویژدانمی بەر

لێزمەیەك لە پرسیارو بەڵگە داوە. ئەی ئەگەر هەبوو؟ ئەی ئەگەر پەروەردگار ئەم گەردوون و مرۆڤانەی بەدیهێنابێت و لێپرسینەوە بكات؟

باشە، من تاچەند بۆ ئەو لێپرسینەوەیە ئامادەم؟

ئەم هەستە ئەگەر تەنانەت ئەگەرێكیش بووایە، بەس بوو بۆ ئەوەی بیر و ناخم داگیر بكات و ئەوەندەی تر گیرۆدەی داخ و پەژارەم بكات. تا بنووسم هەست بە وزەی زیاتر دەكەم، هەروەك بڵێی پێنووسەكەم بەرەو ئەم لایەنە ڕامبكێشێت، بەرەو ئاراستەیەك ڕاپێچ دەكرام كە هەرگیز ئارەزووم نەبوو بیری لێبكەمەوە، نەخوازەڵا ببێتە خولیام. تەنانەت خۆشم نامەزرۆی ئەوەم بزانم كۆتایی ئەم نامەیە چۆن دەنووسم و چلۆن بە پایان دەگات؟

مامۆستا، سەرلەنوێ شەكەتی دایگرتمەوە، توانام نەما، جگە لەوەی بیخەمە سبەینێ، چاری دیم نیە.

## ڕووداوێكی سەرسوڕهێنەر:

سێیەم ڕۆژی نامەكەم، بەڵام ئەمڕۆ زۆر جیاوازە. خۆم لە نێو دەریایەك لە هەست و سۆزی نیاندا دەبینمەوە. ئەم دێڕانەی خوارەوە بە هەنسك و گریانەوە دەنووسم....

شەوگار چارشێوەی خۆی بەسەر ڕۆژدا دادایەوە. بەڵام ئەوەی ڕوونە ئەوەیە كە شەوەكانیش وەك یەك نین، لە قووڵایی و هەناوی ئەو تاریكییەدا تروسكەی ئومێدێك بانگی دەكردم.

شتێكی زۆر سەیر بوو، ڕووداوێكی باوەڕپێنەكراوم بەسەردا هات. هەموو لایەكم دەلەرزێ، لە نێو جۆش و خرۆشێكی بێ وێنەدام.

خەریكە دڵم لە زیندانی سنگم دێتە دەرەوە، ئۆقرە ناگرم، دەبێت بێمەوە سەرخۆم و ڕووداوەكەتان بۆ باسبكەم. ئەم ڕووداوە ژێرەو ژووری

کردم. به جارێك دنیاکەمی هێنایە لەرزە و کەمۆڵەی بیر و هزرمی شڵەقاند. ئەستەمە لە ژێر کاریگەری ئەو ڕووداوەدا بێمە دەرەوە. قامکەکانم هێزو پێزیان لەبەر براوە.

کاتژمێر دووی شەوە، سەعاتێك بەسەر دەرهێنانی سیرەمەکەمدا تێپەڕیوە، بۆ ئەوەی خەوم لێ بکەوێت دەرزییەکیان لێدام، لە ژوورەکەدا تەنهام. لە دووی دەلاقەیەك وێڵم کە لە بیرو بۆچوونە پووچ و نەنگەکانم دەربازم بکات، دووبارە لە ڕاڕەوی ژیانمدا بە ئومێدی تروسکەیەکی نوێ، نیگایەکی موژدە بەخش چاوم لەڕێیە. کەوتومەتە بیرکردنەوە داخۆ ئەم گەردوونە هەروا هەوانتەیە؟ بەرەو نەمان و بوونە هیچ دەڕوات؟ ئەم هەموو زیندەوەر و مرۆڤانە ڕۆژێك دێت دەمرن، جا هەموویان ئەبن بە "نەبوو"؟ سەرلەنوێ جارێکی دی ژیان و، بەیەك گەیشتنەوەو، مرۆڤایەتی نابێت؟

ئایا خوای گەورە ئەم بوونەوەرەی بەدیهێناوە؟ ئایا هەموو شتێك بە فەرمانی ئەو دەبێت؟ واتە دوای ئەوەی دەمرین، دووبارە زیندوودەکرێینەوەو لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێت؟

ئایا بە دایکم –کە هەمیشە تامەزرۆبووم ، لە ئامێزی نیانیدا بخەوم– و باوکم و، برا خۆشەویستەکەم شاد دەبمەوە؟

ئەی ئەگەر دۆزەخ هەبێت؟ ئەوسا من بەم حاڵەوە بەیەکگەیشتنم لەگەڵ ئەو مرۆڤانە ئەستەمی ئەودیو ئەستەم دەبێت. دیسانەوە ئاسوودەیی یاوەرم نابێت.

گەر زیندوبوونەوە ببێت یان نا، لە هەردوو بارەکەدا بەشی من لە خۆشی و ئاسودەیی هیچە. ئۆف دیسانەوە ڕێگە بە بنبەست گەیشتووەکان، دیسانەوە ئازارو مەینەتییەکان....

له سەروبەندی چاوپیاخشاندنەوەی لاپەڕە چڵکنەکانی ژیانمدا ئاڵۆزی ئەو بیرۆکەو ئەندێشانەی کە بە مێشکمدا دەهاتن، دەرگای ژوورەکەم جیڕەیەکی لێوە هات.

ئایا ئەوە خەون بوو یان ڕاستی؟ بەتەواوەتی نازانم، ڕووم بەرەو دەرگاکە وەرچەرخاند، دوو خاتوون.......

هەردوو بالاپۆشی سەرتاپا سپی. لە ڕەنگ و ڕووخسارياندا درەوشانەوەیەکی ڕاز ئامێز بەدی دەکرا. لە ژوورەکەمدا هەستم بە شنەیەکی ناسك و گەرم و گوڕ کرد.

له ساتێکدا چاوەکان یەکتریان دۆزیەوە و نیگاکان یەکتریان پێکا..... خەندەو نیگایەکی ئەوەندە شیرین و ئەفسوناویان هەبوو، دەتوت لە دەوریاندا هێزێکی کێشکردن هەیەو من بەرەو ئەو هێزە ئەفسوناویە کەمەندکێش دەکات.

ئەمانە کێبوون؟ پەرستار نەبوون. پەرستارەکانی ئێرە سەریان ڕووت و بالایان کورت و ئەوەندەش ڕووخۆش و دڵگیر نەبوون.

ئاشکرێت یەکێك بێت لەم کاتەی شەودا بۆ سەردانی من هاتبێت. خۆ ڕووخسار و دڵکێشیشیان زۆر جیاواز بوو لەو کەسانەی کە تا ئەو ڕۆژە دەمناسین، وەك بڵێی ژوورەکە لە کاریگەری ئەوان سەرڕێژ بووبوو.

بە دەنگ و نەوایەك، کە گوێ و مێشك و هەموو جەستەمی هەژاند، ئەو خاتوونەی لە پێشەوە بوو وتی: ساغ و سەلامەت بیت ڕۆڵەکەم.

خاتوونەکەی تریشیان لە بارێکدا بوو هەروەك پێم بڵێ: ئامادەبە.

نەمتوانی وەلامیان بدەمەوە، چونکە بەتەواوتی تاسابووم، تەنها بە خرۆش و لەرزەوە دەمڕوانیە ڕووخساریان.

له ناوەندی هەست و خرۆشێکی نامۆدا بووم. دڵم بە چەشنێك لێی دەدا و کەوتبووە تەپەتەپ، کە وای دەگەیاند ئەویش بەرگە ناگرێت و زۆری نەماوە پارچە پارچە ببێت.

لەوەدا بووم کە بپرسم، ئێوە کێن؟ چیتان پێویستە؟ کە خاتوونەکەی پشتەوە کەوتە قسە:

– ئێمە بە ئیزنی خواو فەرمایشتی پێغەمبەرەکەمان یارمەتی ئەو موسوڵمانانە دەدەین کە لە تەنگانەدان و داوای یارمەتی دەکەن و شایستەی کۆمەکن.

وتەکانیان ئەوەندە هەژێنەرو کاریگەر بوون، تیر ئاسا بەخێرایی رووناکی دەروونیان پێکام و زایەڵەی وشەکانیان رۆحی ماندوو و کلۆڵمیان بە خەبەر هێنا.

له چاو تروکانێکدا ئەم وتانە بوونە هەزاران، ملیۆنان پارچەو بە هەموو کونجێکی لەشمدا پەرش بوونەوە.

"ئێمە بە ئیزنی خواو فەرمایشتی پێغەمبەرەکەمان یارمەتی ئەو موسوڵمانانە دەدەین کە لە تەنگانەدان و داوای یارمەتی دەکەن و شایستەی کۆمەکن".

ئەم وتانە هەروەك بروسکە چەخماخەیان دا و، بوونە لێزمەی باران و ئەوجا پەلکەزێرینەی ئومێدیان بە ئاسۆی رۆحمدا هەڵواسی.

ئەوانە خۆر بوون و پەردە چین لەدوای چینەکانی شەوەزەنگیان تەیکردو دوا بڵێسەکانی ژیانیان لە ناخمدا ژیاندەوە.

ئەوانە زێوانانی کەوسەری ژیان بوون و قومێکی مژدەبەخشیان دایە دەستی لەرزۆکی گەشتیارێکی سەرگەردانی بیابانی دنیا.

کەواتە خوا فەرامۆشی نەکردووم. یارمەتی و پشتیوانی نارد بۆ کەسێکی لێقەوماوی وەك من، وایە؟

ئەمە شتێکی زۆر سەرسوورهێنەر بوو. لەوانەشە کۆتا دەروازەی دەربازبوونم بووبێت.

لە کاتێکدا کە سەرگەرمی بیرکردنەوە و لێکدانەوەی ئەمانە بووم، هەروەك بڵێی ئەو خاتوونە ڕازئامێزە ناخمی خوێندبێتەوە وتی:

– خوای گەورە زاتێکە هەموو شتێك دەبینێت، دەزانێت و بە هانای هەمووانەوە دێت. پێغەمبەری ئازیزیشمانﷺ چاودێری دانەدانەی ئوممەتەکەی دەکات، بە ئیزنی خوا یارمەتی دەنێرێت بۆ ئەو کەسانەی کە لە تەنگانە و بەڵادان.

ئەم هەماهەنگی و ڕێکوپێکییە دەرئاسایەی گەردوون بە زانست و توانستی پەروەردگار بەدیهاتووە. نیعمەتە بێ کۆتاکانی بەخشش و چاکەی ئەون بۆ بەندەکانی.

پەروەردگار بەندەکانی لەبەر ئەوە بەدیهێناوە تا بیناسن و ئەرکی بەندایەتی لە بەرامبەرەوە بەجێبێنن.

بۆ گەیاندنی پەیامەکەشی پەیامبەرو کتێبە ئاسمانییەکانی ناردووە. هەروەك چۆن خوێندکارێك پێویستی بە کتێبی وانەکان و مامۆستا هەیە.

بەڵام جێی داخە هەندێك لە مرۆڤەکان دەبنە بەندەی نەفس و شەیتانەکان و لە پێناو لەزەت و چێژە دونیاییە فانییەکاندا کە لە بنەڕەتدا بۆ ناساندن و سوپاسگوزاری خوا دروستکراون، ئامانجی بەدیهێنانیان کە "ناسینی بەدیهێنەرە" لەیاد دەکەن.

ئەو جۆرە مرۆڤانە گەر بە وردی و ژیرییەوە تەماشای تەنها مێشێکیش بکەن، بۆیان دەردەکەوێت کە چەندە دروستکراو و بەرهەمێکی

ناوازەیەو، زانست و توانستی خواوەند لەو بەدیهێنراوە بچکۆلەیەدا دەبینین.

وەلێ ئەوانە کەوتوونەتە گوێڕایەڵی نەفس و شەیتانەوە. بیر لەوە ناکەنەوە کە بەدیهێنان و ناردنی مرۆڤ بۆ دونیا چەند کارێکی مەزن و دەرئاسا بێت، دووبارە زیندووبوونەوە و لێپرسینەوەش ئەوەندە مەزنە، ئایا بۆ ئەو توانستەی کە مرۆڤی لە (نەبوون)ەوە بەدیهێناوە، سەر لەنوێ زیندووکردنەوەی کارێکی زەحمەتە؟

ئەم ڕستانە بۆ خۆم و، دیدگاو فەلسەفەی ژیانم وەڵامگەلێکی کاریگەرو قایلکەربوون.

سەرەڕای ئەوەی هەموو ئەمانەم سەدەها جار لە هاوڕێ و مامۆستاکانمەوە بیستووە، بۆچی وەك ئێستا کارتێکراو و گومان ڕەوێن نەبوو؟

هەر وشەیەك و، ڕستەیەکیان لە مێشکمدا دەزرِەنگایەوە و بەرهەڵستی و نکۆڵیکردن هیچ باسی نەبوو.

– دایکت زۆر نزات بۆ دەکات. زۆر مەراق و پەرۆشی تۆیە. خۆت ئامادە بکە و تۆبە بکە. داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە.

میهرو بەزەیی ئەو لە پێش سزاو توڕەییەوەیەتی، لە خوا بپارێرەوە و کەموکورتییەکانت تەواو بکە. چونکە تەمەنت زۆر کورتە.

دوای ئەم پەیڤانە، ئەو دوو خاتوونە سەرتاپا نوورانییەی کە وەك بروسکەیەك هاتن، هەرواش لە ساتێکدا لەبەرچاوم نەمان. تەنها جیرەی دەرگاکەم بیست، هەرئەوەندە........

## له پاش ڕووداوەکە...

ئەی خوایە، ئێستا من چی بکەم ؟ لە بەرامبەر ئەم میهرو سۆز و یارمەتییەوە بۆ بەندەیەکی سەرکەش و گوناهکاری بێ باوەڕت چی بکەم؟ بگریم؟ بیکەم بە شیوەن؟ یان هەزارەها جار خۆم بکەم بە قوربانت؟

جگە لە سەرشۆڕی و، گوناه و بێ گوێیی هیچی تر شك نابەم. دۆعاو لالانەوە و نوێژ و پەرستشەکان لە من زۆر دوورن. لە جێگاکەم ڕاپەڕیم. هەموو گیانم دەلەرزی، خۆم لەناو ترس و خرۆشێکی بێ وێنەدا دیتەوە. بەڵێ خوا هەیە، هەر ئەوە خاوەنی گەردوون... ئێمەش بەندەی ئەوین، بەڵام هیچ وردەکاری و درێژەیەك نازانم. لە کوێوە و چۆن دەست پێ بکەم؟ چی دەبێت با یەکێك یارمەتیم بدات! پەرستارەکان هاتن بەدەم گریان و شیوەنمەوە، بەڵام نەمدەتوانی ئەوەی بەسەرمدا هاتووە بۆیانی بگێڕمەوە.

– هیچ نییە. تەنها کابوسێك بوو و بەس.

هەنگاو هەنگاو بەرەو مەرگ دەڕۆم. مێشکیشم زۆر ئاڵۆزە. ئەمێستاکە هەر ئەسرینێکی جۆگە بەستووی سەر گۆنام، کۆڵەواری و، بەدبەختی و، گومڕاییەکی لە دووتوێی خۆیدا مەڵاس داوە. دەزانم ئەو شتانەی بینیمن دوایەمین هەل و، کۆتا ئاگادارکردنەوە بوو بۆم، دەشزانم کە بەزەیی و لێبوردەی پەروەردگارم منی لەیاد نەکردووە، بەڵام لە دوایەمین وێستگەی گەشتەکەمدا سەرسام و پەشۆکاوم.

لە قوڵاییەکانی ناخە زامدارەکەمەوەو، لەژێر چینە تارەکانی خاکی وشك و برنگی دەروونمەوە، هەستم دەکرد تۆوێك کە پێڕستی درەختێکی مەزن بوو، دەیویست سەردەربێنێت و چەکەرە بکات.

دانە دانەی خانەکانی لاشەم خۆیان بۆ وتنی وشەیەك ئامادە کردبوو. تەنها وشەیەك کە (الله) بوو... بەڵێ ئەمە یەکەم جارە کە خۆم وا دەبینم بڵێم: "الله"!

ئەمە چ لوتفێکە، چ دلۆڤانی و میهرێکە، ئەو کات کە گشت دەرگاکان لە ڕوومدا داخران، خونچەی ئومێدەکان ژاکان، بە هاناو هاواری بەندەی خۆتەوە هاتیت.

—دەی توخوا با ئیتر یەکێك بێت! خواو ئاخیرەتم تێبگەیەنێت! من دەڕۆم.

"تکاتان لێدەکەم"

لە پەرستارو دکتۆرەکان دەپاڕامەوە و بەروانکەیانم بەر نەئەدا.

— هاوڕێیەکم هەیە بە ناوی (ئەمینە)وە لە کۆلێژی پزیشکی دەخوێنێت، بیدۆزنەوە زۆر پێویستم پێیەتی، توخوا با بێت....با بێت.

با ئەمینە بێت و ئەو ڕاستییانەی کە باسی دەکردو من گوێم پێ نەدەدا بۆم باس بکاتەوە. ئیدی تۆرەی ئەوانەیە!

زۆر ئاتاجی ئەو ڕاستییانەم، چاوەڕێتم ئەمینە...

"لە ژیانمدا هەرگیز شتێکم بەو پەرۆشییە نەبیستبوو، پەروەردگارا، ڕووی ئەوەم نیە داوای هیچت لێ بکەم، زەبوونم، لە خاوەنی خۆم هەڵهاتووم، بەلام لەبەر خاتری دایکم، براکەم، ئەو کەسە باشانەی دەیانویست یارمەتیم بدەن...پێش ئەوەی بمرم شادمکە بە ئەمینە، بەر لەوەی سەرمایەی مایەپوچی تەمەنم کۆتا بێت بمگەیەنە بە ئەمینە، نامەوێت بەکۆڵی قورس و گرانی تاوانەوە بێمە حزوورت. دەزانم کە گوناهی زۆر گەورەم کردووە کە شایەنی لێخۆشبوون نییە، بەلام دوا مۆڵەتم بدە"

ئا لەو ساتانەدا یەکسەر ئەو کارمەندەم وەبیر هاتەوە کە لە بەشەکەی ئێمەدا بوو. لە هەر هاتنە ژوورەوەیەکیدا ورەی بەرز دەکردمەوەو داوای لێ دەکردم پشت بە خوا ببەستم و ئارامگریم.

بەڵێ، ئەو دەیتوانی لەم بابەتەدا یارمەتیم بدات. پێویستە بیدۆزمەوە، هەموو شتێکی بۆ باس بکەم و داوای یارمەتی لێبکەم. تکاتان لێدەکەم یارمەتیم بدەن!

هەر کە بەیانی بووەوە یەکەم کارم دۆزینەوەی ئەو کارمەندە بوو. هەمووشتێکم بە وردەکارییەکانیەوە بۆ باسکرد، گەنجێکی زۆر پاك و ڕەوشت بەرزبوو، بەدەم فرمێسکەکانییەوە گوێبیستی بەسەرهاتەکەم بوو. لێی پاڕامەوە تا کۆمەکیم بکات.

وتی: خەمت نەبێ، یارمەتیت دەدەم، پشتیوان بە خوا تۆ لەم کارەدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنیت.

دوای چەند کاتژمێرێك لەگەڵ خانمێکی داپۆشراودا کە وەك گوڵ شۆخ و جوان بوو گەڕایەوە و وتی:

– بە دەستگیرانەکەمت دەناسێنم، لە هەر بابەتێکدا کە دەخوازیت یارمەتیدەرت دەبێت.

تەماشای کاری خودا بکەن، ئەویش لە یاسا دەیخوێند. هەروەك دەروونزانێك مامەڵەی دەکرد. بەڵکو بلیمەتتر، هۆگرتر، ناوی "ئەبرونوور"بوو.

بینینەکانم بۆ ئەویش گێڕایەوە. لە ئامێزی گرتم و دەستی کرد بە گریان.

– تەماشای گوناهەکانت مەکەو نائومێد ببیت. ئەمانە موژدەگەلێکی گەورەن! ئێمە سەرەڕای ئەوەی بەندەگی و پەرستشەکانمان بە

بەردەوامی ئەنجام دەدەین، کەچی شایستەی لوتف و ڕێزلێنانێکی ئاوا نەبووین. سۆزو بەزەیی ناکۆتایی پەروەردگار تۆشی خستوەتە بەر لێزمەکەی.

پیرۆزباییت لێدەکەم تەنانەت ئێرەییشت پێدەبەم.

بە زمانە شیرینەکەی و هەڵسوکەوتە جوانەکانی ئومێدی پێدەبەخشیم و ئیرادەی بەهێز دەکردم. باوەشم کرد بە دەستەکانیدا، لەوانەشە لە من بچوکتر بووبێت بەڵام ئەمە ڕاستیەکەیە.

داوام لێکرد کە یارمەتیم بدات و پێم وت:

– من پەلەمە، دەبێت تەمەنێك بترنجێنمە نێو چەند ڕۆژێکەوە. هاوکاریم بکە، چۆن و لەکوێوە دەست پێبکەم؟

بەدەم ئارامکردنەوە وتی:

– هیچ نیگەران مەبە، دڵتەنگ مەبە، من ئیدی لەگەڵتدام. سەرەتا با لە نوێژەوە دەست پێبکەین، دواتریش کتێب دەخوێنینەوە و باس و خواستی لەسەر دەکەین، با کەموکورتییەکانمان تەواو بکەین.

منیش هەروەك ئەوەی سەرلەنوێ لە دایك بووبێتمەوە:

– زۆر باشە، من ئاتاجی ئەمانەم، تا ئێستاش دڵ و مێشکم پڕن لە پرسیارو گومان. دەمەوێت لەوانە ڕزگارم بێت و ببمە خاوەن ئیمانێکی تەواو دامەزراو.

– مەترسە ئازیزم، بە پشتیوانی خوا هەمووی چارە دەبێت.

پرسیارەکان.......

پێکەوە بەرنامەیەکمان دانا.

خاتوو ئەبرونوور بەیانیان کاتژمێر هەشت دەهات و تا پێنجی ئێوارە لەلام دەمایەوە.

لەم ماوەیەدا نوێژو دوعاکانم فێردەکات و وەڵامی پرسیارەکانم دەداتەوە و وتووێژ لەمەڕ کتێبەکانی "پەیامەکانی نوور" دەکەین. دوای خۆی کتێبەکانم بۆ جێدێڵێت تاوەکو ببێتە هاودەمی شەوم.

ئیدی بەرنامەکەمان بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت. پەسەندکردنی ئەو خۆشی و ئاسودەیی‌یەی کە وەك پۆشاکێك ببووە کاڵای باڵام چ گونجاوە ! ئای وشە، خۆزگە بتتوانیایە ببیتە وەرگێڕی هەست و سۆزە نیانەکانی دڵ، ئیدی دڵیش خۆی لەوە ڕزگار دەکرد کە زمانحاڵی خۆی بکاتە ئەسرین، تاوەکو سۆماش بە لێزمە فرمێسك هەڵنەوەرێنێت، بەتەمای پەلکەزێرینە مەبە لە ئاسۆی ڕۆحدا نومایان بێت. مەگەر جگە لە کڵۆ فرمێسکەکانی بەهاری پەشیمانی چیتر تینوێتی ڕۆح دەشکێنێت؟

ئەمێستاکە ژیانم پڕە لە کامەرانی......

دەستم کرد بە فێربوونی نوێژو نزاکان، لە هەردوو کتێبی "ڕابەری لاوان" و "ڕابەری خوشکان"یش کۆمەڵێك بابەتی زۆر خۆش و گرنگمان هەڵبژاردو پێکەوە دەمانخوێندەوە. باس و خواسی ئیمانی بەچێژمان ئەنجام دەدا.

مەگەر چ چێژو ئاسودەییەکی باس نەکراو لە ئیماندایە !

یەکەم پرسیار کە لە ئەبرونوور خانمم کرد ئەمە بوو:

– بەردەوام سوکایەتی پێکردن و، چەواشەکردن و، ئاتاجبوونی کەسانی ترو، بینینی مامەڵەی نامرۆڤانە، هەموو ئەمانە منیان بەرەو سەرکەشی ڕاپێچ دەکرد. کاتێك ئەو لاوە هاوتەمەنانەی خۆمم دەبینی کە لە نێو خۆشی و، ڕابواردن و، تێرو تۆخیدا دەتلانەوە، تۆران و یاخی بوونم هێندەی تر زیادی دەکرد.

ئەمە ئەو هۆکارانە بوون کە منیان ڕاپێچی هەڵهاتن و ملەجیڕێ کرد.
بۆچی کەوتمە ناو ئەم بارەوە؟ گوناه و تاوانی من چی بوو؟
ئەم ستەمە لە پای چی؟
بۆچی گیرۆدەی ئەم نادادپەروەری و ستەمانە کرام؟
خۆ من ئەم تەرزە ژیانەم نەویست. ئایا دەبوایە تا سەر بەو چەشنە زیندەگیم بگوزەراندایە؟
دەی ئەگەر وایە بۆچی کەسانی دی بە خۆشی و لەنێو ناز و نیعمەتدا دەژین و منیش لە ژێر پێیەکاندا دەپلیشامەوە؟
ئیتر ئەمە بوو بە بناغەی فەلسەفەی یەکسانی و بێ باوەڕییەکەم.
ئەم پرسیارە بە درێژایی ژیانم ببووە پشکۆیەك و داغی دەکردم.
بەڵێ خوا هەیە، بەڵام ئەم نادادپەروەری و ناحەقیە بۆ؟ تکایە ئەم بابەتەم بۆ ڕوون بکەنەوە. تا ئەم سەرکێشییەی ناخم نەڕەوێتەوە، کەشتی ناخم لە کەناری ئارامی لەنگەر ناگرێت.
ئەبرونوور کە بە هێمنی و بایەخ پێدانەوە گوێ بیستی دەردو زامی کەڵەکەبووی ساڵەهای پڕ ئازارو تاڵی منی بێ نەواو بێ کەس بوو، بەم شێوەیە وەڵامی دامەوە:
– خوای گەورە دوو ڕاسپاردەی زۆر گرنگ و پڕ نهێنی بە مرۆڤ بەخشیوە، یەکەمیان ژیان و جەستەی خۆمانە کە بە (گەردوونی بچووك) دەناسرێت، دووەمیشیان: گەردوون (گەردوونی گەورە) و بەخششە ناکۆتاکانی ناویەتی.....
گەر ئادەمیزاد سروشتی ژیان و ڕێساکانی گەردوونی تێك نەدایەو بە گوێرەی "مەبەست لە بەدیهاتنیان" بەکاریان بهێنایە، ئەوا هیچ جۆرە کێشەو گرفتێك سەری هەڵنەدەدا.

جا بۆیە سەرچاوەی گرفت و ناسازییەکان (حاشا) نادادپەروەری پەروەردگار نیە، بەڵکو گشت ئەو کێشەو نارێکیانە دەرئەنجامی بەدڕەفتاری و خراپ بەکارهێنانە لە لایەن مرۆڤەوە.

ئەو بەدیهێنەرەی کە چاو، مێشك، دەست، ژینگەو هەموو بوونەوەرانی لە جوانترین شێوەو باڵاترین تەرزدا بەدیهێناوە، چۆن بەرپرس دەبێت لە نادادپەروەرییەك کە سەرئەنجامی هەڵە بەکارهێنان و زیادەڕەوی مەردوومانە؟

ئەوەی بە چاوی دانستەوە سەرنجێکی ژیرانەی کۆشکی گەردوون بدات سەراسیمەو حەپەساو دەمێنێتەوە لە ئاست ئەو هەماهەنگی و ڕێکسازییەی لە نێو ئەم کۆشکە باڵادەستەدا هەیە. ڕوانینەکانت ئاراستەی هەر کونجێك و، هەر بستێك و، لە گەردیلەوە تا گەلەئەستێرەکان دەکەیت، دەستی زانست و توانستی کارسازێکی خاوەن دانستی ڕەها دەبینیت.

بەڵێ، کردگاری بەتوانا کە بە دانست و مەبەستێکی مەزن ئێمە و بوونەوەرانی بەدیهێناوە، مۆرکی تەواوی و نەخشی کارسازی لەسەر گشت بەدیهاتووان نەخشاندووە، دەستی هیچ جۆرە ناتەواوی و نوقسانییەك ناگاتە بەرۆکی دروستکراوەکانی. هەمووان بە زمانی ڕێکسازی و هاوسەنگی و ئارایشتیان گەواهی ئەم هەقیقەتە دەدەن.

جا ئەو ڕووداو کارەساتانەش کە بە ڕواڵەت بە ناهەقی و نادادگەری دەبینرێن، چەندەها حیکمەت و هۆکاریان لە دوو توێدا حەشار داوە، کە لە ڕوانگەی ئێمەوە پەنهانن.

یاخود ئەوەتا بە دەستی خۆمان و لە ئەنجامی هەڵە بەکارهێنانی خۆمان گرفتاری لاسەنگی و دەرچوون لە ڕێسا سروشتییەکانیان بوون.

بڕوانـه گـەر ئێسـتە کەسـێکی دەوڵەمەنـد بێتـە ژوورەوە و پارەمـان بەسەردا دابەش بکات، بەڵام بە هەندێکمان کەم و، بە هەندێکی ترمـان زۆر بدات، تۆ دەتوانیت بەو کەسـە بڵێیـت: "بۆچـی کـەمت دا بـە مـن و بـەوانی تریش زۆر؟" گەر وا بکەیت بێ ڕێزییەکی ئاشکرا دەنوێنیـت. چـونکە ئـەو پارانەی کە پێت دراوە، تۆ شایستەی نـەبوویت و هـی خـۆت نـەبووە. ئـەو کەسە بەزەیی پێتـدا هاتوەتـەوە و یارمـەتی داویـت. بـڕی یارمەتییەکـەش خۆی دیاری کردووە. لەم بارەدا تۆ مافی سکاڵات نییە. ئەگـەر نـاڕەزاییش دەربڕیت ئەوا ئەو پارەیەی کە پێی داویت لێت دەسێنێتەوە.

پـەروەردگاری دلۆڤانمـان هـەم نیعمـەتی گـەردوون و، هـەم نیعمـەتی مرۆڤایەتی پێ بەخشیوین. بەڵام بـە هەنـدێك زۆر و بـە هەنـدێك کـەم. ئـەم دونیــاش لەبــەر ئــەوەی گۆڕەپــانی تاقیکردنەوەیــە، ئەوانــەی زۆری پێبەخشیون بە لێپرسینەوەی زۆر و، ئەوانەشی کـەمی پـێ بەخشـیون بـە لێپرسینەوەی کەم تاقیان دەکاتـەوە. ئەوانـەی کـە دەزانـن خـوای گـەورە زۆری پێبەخشیون دەڵێن: "تاقیکرنەوە و لێپرسـینەوەم زۆرە" لـەخۆبایی نـابن و فیـز لێنـادەن. بـە پێچەوانەشـەوە ئـەوان لەبـەر لێپرسـینەوە و ئەزموونکردنیان لەو ماڵە زۆرەدا باری سەرشانیان گرانتر و قورسترە.

ئەوانەشـی کـە کـەمیان پێـدراوە مـافی ئـەوەیان نییـە سـکاڵا بکـەن و بڵێن: "بۆچی کەممان پێدراوە؟" و دادپەروەری پەروەردگار تاوانبار بکەن. چـونکە ئـەو بەخششـەی کـە دەدرێـت بـە بەنـدە هـی بەنـدە خـۆی نییـەو شایستەشی نییە، بەڵکو ڕاسـتەوخۆ مـوڵکی خوایـە و لوتـف و بەزەییـەکی ڕووتی ئەوە.

بەندە هەرچەند کەمیشی پێبدرێت، ناچارە سوپاسگوزار بێت، چونکە بە نیعمەتێ شادبووە کە ڕەوای نەبووە. هەروەها لێپرسینەوە و تاقی کردنەوەکەشی بەگوێرەی ئەوەیە.

## نموونەکانی "بەدیعوززەمان" ناوازەبوون....

خاتوو ئەبرونوور بەردەوامە و منیش گوێی لێ ڕادەگرم...

– ئایسێلێ گیان، با بە نموونەیەك لەو کتێبەی کە دایکت بە ڕاسپاردە بۆی جێهێشتویت "وتەکان" کە نووسەرەکەی "بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نورسی"یە، بابەتەکە زیاتر ڕوون بکەینەوە:

" تۆ مافی ئەوەت نییە تەماشای ئەو کەسانە بکەیت کە لە ڕووی تەندروستییەوە لە سەرو خۆتەوەن، ئەوجا سکاڵا بکەیت. بەڵکو فەرمانبەری ئەستۆت ئاڕاستەکردنی ڕوانینتە بۆ ئەو کەسانەی لە ڕووی تەندروستییەوە لە خوار خۆتەوەن و ئەنجامدانی شوکرانەبژێرییە"

"ئەگەر دەستت شکاوە، بڕوانە ئەوانەی دەستیان بڕاوەتەوە. گەر هاتوو چاوێکت نەبوو، تەماشای ئەو نابینایانە بکە کە هەردوو چاویان لەدەست داوە! سوپاسگوزاری پەروەردگارت بە. بەڵێ، هیچ کەس مافی ئەوەی نییە لە ڕوانگەی نیعمەتەوە سەیری سەرووی خۆی بکات و سکاڵا بکات. بەڵکو پێویستە هەموو کەس لە ڕووی موسیبەت و بەلاوە سەیری خواررووی خۆی بکات و سوپاسگوزار بێت.

ئەوجا بەدیعوززەمان نموونەیەك دەهێنێتەوە:

"ئایا گەر پیاوێك تا سەر لوتکەی منارەیەکی بەرز، پلە پلە سەربخرێت و لە هەموو پلەیەکیشدا دیارییەکی بەنرخی پێشکەش بکرێت هەتا دەگاتە بەرزترین شوێنی لوتکەی منارەکە.. ئایا ئەو پیاوە مافی ئەوەی هەیە سوپاسی خاوەنی ئەو دیاری و نیعمەتانە نەکات و هێشتا بەدەم خەم و

پەژارەوە بڵێت: بۆچی توانای سەرکەوتنم پێ نەدرا تاکو لەمەش بەرزتر سەربکەوم؟! ئایا گەر ڕەفتاری وا بنوێنێت چەندە کارەکەی ناڕەوا دەبێت و خۆی دەهاوێتە کەندەلان و شیوی: (ناشوکریی نیعمەت)ەوە و چەندەش خۆی گرفتاری گومڕاییەکی بێزلێکراو دەکات!

هەر بەم جۆرەش تۆی (مرۆڤ) لە (عەدەم)دا نەماویت، بەڵکو نیعمەتی (بوون)ت لەبەرکراوە و تامی (ژیان)یشت پێ چێژراوە. تەنانەت نەشکراوی بە بوونەوەرێکی بێ گیان یاخود زیندەوەرێکی وەك ئاژەڵ! بەڵکو بە (مرۆڤ) دروست کراویت و بە نیعمەتی (ئاینی ئیسلام) شاد و بەختەوەر بوویت و لە تەنگ و تاری گومڕاییدا نەماویتەوە و سەرباری هەموو ئەمانەش بەهرەمەندی نیعمەتەکانی: لەشساغی و.. بێ وەیی و .. هتد... کراویت.

جا دەربڕینی ناڕەزایی و سکاڵاکردن لە بەرامبەر چەند ئازارێك، یان لە دەستدانی تەندروستی بەهۆی هەڵە هەڵبژاردن و بەکارهێنانی چەوتی خۆتەوە و لە زار دەرچوونی : (ئاخ! بۆچی ئەمەم بەسەردا هات)، کە بۆنی تۆمەتبارکردنی پەروەردگارێتی خواوەندی لێ دێت، نەخۆشییەکی مەعنەوییە و زۆر لە دەردە مادییەکە ترسناکتر و کوشندەترە. هەروەك لێدانە بە دەستی شکاو".

بابەتەکان لە مێشکمدا دەزرنگانەوە، وەلێ ئاوەزی لەهۆشخۆچوو و ژیریی پەرتم ئامادەگی تەواویان نەبوو، هەربۆیە نەمدەتوانی وەك پێویست سوودمەند ببم.

فێرکارە دڵسۆزەکەم ئەبرونوور بە زمانە شیرینەکەیەوە بەردەوام بوو لە ڕوونکردنەوە:

– ئێمە لەلایەن زاتێکی خاوەن توانستەوە دەنێردرێینە دنیا، کە گۆی زەوی بۆ کردووین بە سفرە و خوانێکی ڕازاوە، لەسەر ئەو سفرە پەروەردگارییە بێ وێنەیەدا هەزاران نیعمەت و بەخششمان پێشکەش دەکرێت.

بۆ گەیشتن بەم ئاستەی ژیان و ئەم پلەی مرۆڤایەتییە هەروەك پێپلیکانەکانی منارەکە چەندەها پلەی ژیانمان بڕیوە. پلەوپایەی مرۆڤایەتیش بەرزترین و ڕێزدارترین پلەی نێو بوونەوەرانە.

بیربکەرەوە، دەگونجا بەرد، خۆڵ یان قەوزە بیت. یان لە پلەی ئاژەڵاندا پشیلە، سەگ، خشنۆك یان مێروو بیت، خۆ ئەوانیش گیانیان هەیە و زیندەوەرن. ڕووەك لە چاو خۆڵ و بەرددا لە پلەیەکی بالاتری ژیاندایە، هەربۆیە دەبێت سوپاسگوزار بێت. پشیلەش بەراورد بە مشك سوودبەخشترە، بۆیە پێویستە ئەویش سوپاسگوزار بێت.

ئیدی بەم شێوەیە...

جا ئەو مرۆڤەی کە ئەم هەموو پلە و ئاستانەی زیندەگی بڕیوە و کراوەتە خاوەنی هەزارەها ئامێر و کۆئەندامی بەنرخ و بەها، گشت ئەم چاکانەی لەبیربچێتەوە و بڵێ: "بۆچی من وەك مرۆڤەکانی تر نیم؟ ئەمە نایەکسانی و نادادپەروەرییە"، ئەوا ئەوکات مشك، جاڵجاڵۆکە، مار و پشیلەش هەڵدەدەنێ و مافی ئەوەیان دەبێت بڵێن: "ئێمەش نامانەوێت، با شوێنەکەمان بگۆڕینەوە".

هیچ مافێکی ئێمە نەخوراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە چەندەها نیعمەت و مافمان پێڕەوا بینراوە کە هیچ شایستەی نەبووین.

بیردەکەینەوە، دەبینین، دەدوێین، دەخۆین، دەچێژین، دەخەوین، پێدەکەنین و دەگرین، ئاخر چۆن دەبێ چاوی خۆمان لە ئاست ئەم هەموو دیاری و بەخششانە بقوچێنین!

ئەگەر هەموو ئەنقەرەمان بدەنێ و لە بەرامبەریەوە داوای ئەقڵمان بکەن، ئایا دەیدەین؟!

ئەی کە وایە بۆچی بایەخ و گرنگی نادەینە بانگەواز و پەیامی ئەو زاتەی کە خاوەنی کۆئەندام و دەزگا بەنرخەکانمانە؟

لەبەرچی بیر لەوە ناکەینەوە چی لێمان دەوێت و بۆچی پێی بەخشیوین؟

ئێمە دروستکراوین، کەواتە دروستکارێکمان هەیە.

بەدیهێنەری مرۆڤ، ستەم لە مرۆڤ ناکات، تەواو بەپێچەوانەوە، ئەوی زۆر خۆشدەوێت و کردویەتییە تەوەرەی سۆز و بەزەیی فراوانی خۆی.

ئەو شتەشی کە بە ڕواڵەت بە ناهەقی دەبینرێت، چەندەها لایەنی دانستی پەنهانی لەخۆ گرتووە. لەم گۆڕەپانی تاقیکردنەوەی دونیادا هەرکەس بە شتێك تاقی دەکرێتەوە.

ئاستی تاقیکردنەوەکەشی بەگوێرەی توانا و لە سنووری لێهاتنەکانیدا دەبێت.

ئەوەی کە چاوی نییە، چاو نابێتە هۆی تاقی کردنەوەی، سەرەڕای ئەمەش لەبەرامبەر ئەوەوە پاداشتی دەدرێتەوە.

ئەی ئەوەی کە چاوی هەیە؟ ئەوەش کە چاوی هەیە بەرامبەر چۆنیەتی بەکارهێنانی هەرساتێکی چاوی لێپرسینەوەی لە تەکدا دەکرێت. هەموو شتەکانی تریش وەك ئەمەیە.

## کتێبی "وتەکان"ی مامۆستا سەعیدی نوورسی..

ڕۆچـووبوومە نـاو لێپرسـینەوەیەکی قووڵـەوە. هـەر وشـەیەك، هـەر ڕستەیەك کە دەمبیست هەژانێکی ژێنەرەوەی لە جیهانی دەروونمدا بـەرپا دەکرد. کەواتە ئەم ڕوونکردنەوە ژیـر و وردانـە دەگەڕانـەوە بـۆ نووسـەری ئەو کتێبەی کە دایکم خوێندبوویەوە.

ئـای دایـە گیـان! مەگـەر تـۆ چـەندە مرۆڤێکـی بـەڕێز بوویـت، بـەو گوندییـەی خۆتــەوە هــەروەك زانایــەك ژیاویــت و زیندەگییــەکی ڕوون و سازگارت بەسەربردووە. ئەمێستاکە زۆرباش لێت تێدەگەم و ڕازی ئەو دوو سپاردەیەشم بۆ ئاشکرا بوو.

یەکێکی دیش لەو دومەڵی گومانانەی مێشکمی تەنیبوو، ئـەم پرسـیارە بوو: "خواوەند ئەم گەردوونەی بۆچی دروستکردووە؟" ئەمەشم پرسی.

– خواوەند ئەم دونیایـەی بۆچـی دروسـت کـردووە؟ زۆرێـك لەمـەردوم بـەهۆی بەدڕەفتارییـەوە دۆزەخـی دەبـن و ژیانیـان دەبێتـە زینـدان. گـەر دروستی نەکردایە ئەم هەموو ئازار و تاڵیە نەدەچێژرا، ئەوکات هیچ شـتێك نەدەبوو، نە خۆمان، نە ئازارەکانمان نەدەبووین..

ئەم پرسیارانە و هاوشێوەکانیم بە مەبەستی تانە و تەشەر نەدەپرسی، بـەڵکو ئامـانجم گەیشـتن بـوو بـە حەقیقـەت. دەمویسـت هەرچـی زووتـرە دەلاقەیەك بۆ ڕێگە بە بنبەست گەیشتووەکانی دەروونم بدۆزمەوە.

ئەبرونوور هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەیشمی دا:

– بەدیهێنانی گەردوون ویستی زاتی بەتوانا و شکۆمەندە. پرسیارکردن و بەدواداچـوونی هۆکـاری ئـەم "ویسـتە"وەك دروسـتکراوێك ناکەوێتـە ئەستۆی ئێمەوە.

گەر پیاوێکی دەوڵەمەند بە سۆزێك کە لە دڵیەوە هەڵقوڵاوە، کەسانێکی ئاتاج و نەدار پۆشتە بکات، خواردنیان دەرخوارد بدات، خەرجیان بکێشێت و ئاسوودەیان بکات، دواتر یەکێك ڕاست ببێتەوە و خۆی بنوێنێت و بڵێت: "هەموو ئەمانەت بۆچی کرد، نەدەبوو ئەمانەت نەکردایە؟" چەندە بێ ڕێزی و نابەجێیی دەنوێنێت.

هەربۆیە پرسیارکردن و ڕەخنەگرتن لەوەی کە بۆچی خوای گەورە گەردوونی بەدیهێناوە، جۆرێکە لە بێ ڕێزی و کاڵ فامی.

ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەی ئەم بابەتە بەپێی پێوانە ئەقڵییە کۆتاکان مرۆڤ ناگەیەنێتە ئەنجامێکی دروست، چونکە گەر زاتی بەدیهێنەری شکۆمەند مەبەستی بەدیهێنانمان بۆ ڕوون نەکاتەوە، ئەوا ئێمەی بەدیهێنراو دەستەوسان دەمێنین لە ئاست لێکدانەوە و شرۆڤەکردنیدا.

گەر هەوڵی لێکدانەوەشی بدەین، هەوڵەکان کەم و کورت و ناکام دەبن. بەڵام لەڕووی وەڵامدانەوەیەکی کەمیش بێت بۆ ئەم پرسیارە دەتوانین بڵێین:

سەرەتا ئەبێ ئەوە بزانین کە "بەدیهێنان" لە ئەنجامی پێویستییەك و ئاتاجبوونەوە نەبووە، بەڵکو ویستێکی خواییە کە زاتی مەزنی خۆی دەیزانێت.

گرنگترین هۆکاری بەدیهێنانیش بریتیە لە ویست و ئیرادەی خوایی بۆ بینین و درەوشانەوەی ناوە جوان و کەماڵاتە مەعنەوییە پیرۆزەکانی زاتی خۆی لە ئاوێنەی دروستکراوەکانیدا. بەو واتایەی ویستی پەروەردگارە بۆ تەماشاکردنی تیشك دانەوە و تەجەللیاتی بەرهەمەکانی زانستی ڕەهای، ناوازەیی توانستی، درەوشانەوەی جوانی، فراوانی دەوڵەمەندی، بەردەوامی و گشتگیری سۆز و بەزەیی لە ئاوێنەی بوونەوەراندا.

هەروەك زانراوە، دەستورێکی بەناوبانگ هەیە دەڵێت: (هەموو خاوەن جوانی و کەماڵێك دەخوازێت جوانی و کەماڵی خۆی ببینێت و پیشانیشی بدات).

ئەم خواست و ئارەزووە لە هونەرمەندە بەهرەدارەکاندا دەبینرێت. بۆ نموونە وێنەکێشێکی کارامە تابلۆ و وێنەی جۆراوجۆر دەکێشێت، سەرەتا خۆی سەیری بەرهەمەکانی دەکات و ناوازەیی دەست ڕەنگینیەکەی تیادا دەبینێت و چێژێکی لەڕادەبەدەر وەردەگرێت. دواتر بۆ نمایشکردنی شاکار و بەرهەمەکانی پێشانگا دەکاتەوە و پیشانی تەماشاکەرانی دەدات. لە دەستخۆشی و پیرۆزباییەکانی ئەوان خۆشی دێت.

هەروەها زانایەکی توێژەرەوەش کتێب دەنووسێت و لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەکانی لە پەرتووکێکدا تۆمار دەکات، تا ئەوەی کەسانی دیش لە زانستەکەی ئەم سوودمەند ببن.

جا ئەوکات کە بینی خوێنەرەکانی سوودمەند بوون و سوپاس و پێزانینەکانیانی پێگەیشت، تام و چێژێکی بێهاوتا وەردەگرێت.

لایەنێکی تری ئەم بابەتە کە پێویستە ئاماژەی پێ بدەین ئەمەیە کە"خوای بانیسەر لە فەرمایشتێکی قودسیدا دەفەرموێت: "بونەوەرانم دروست کرد تاوەکو سوود و لوتف و چاکەم بۆ ئەوان بێت، نەك بۆ من. واتە سوود لە من وەربگرن، نەك من لەوان". ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بنەڕەت و سروشتی بەدیهێنراوان دەسلەملانێی کۆڵەواری و لاوازییەکی بێ سنوورە و سەرتاپا ئاتاجی سۆز و چاکەی پەروەردگاریانن.

ئایا ڕەوایە لەبەرانبەر ئەو زاتە خاوەن شکۆ و کردگارە مەزنەوە کە هەموو بونەوەرانی لە (نەبوون)ەوە هێناوەتە (بوون)و، بە نیعمەت و چاکەی لە ژمارە بەدەر ئارایشتی کردوون و گەورەترین و پەنامەکیترین

پێویستی و حەزەکانی بۆ هێناونەتە جیّ و، بەڵێنی ژیانێکی جاویدانی پێداون. بوترێت: "بۆچی ژیان و بوونەوەرانی دروستکردووە؟".

کەواتە گرنگترین کاری مرۆڤ پەی بردنە بە نهێنی و دۆزینەوەی مەتەڵەکانی پەیوەست بە خۆیەوە. بۆچی دروستکراوە؟ ئەرك و وەزیفەی چییە؟ بۆ کویّ دەڕوات؟ لەلایەن کیّ و چۆن لیّ پرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت؟ ئەو زاتەی کە چوار وەرزی بە ناز و نیعمەت تەنیوە، چی لیّ داوا دەکات؟

بەر لە هەرشتێك، وەلامی ئەم پرسیارانە بۆ مرۆڤ جیّی بایەخ و تێڕامانە.

## یەکەم نوێژ

**چوارەم ڕۆژی نامەکەم:**

یەکەم نوێژ... لە ژیانمدا لە تاسە و جۆش و خرۆشی وەهادا نەژیابووم. هەروەك بڵێی پشکۆ جەرگ سووتێنەکانی جەستەم خامۆش بوون و باڵە ناسکەکانی شنەیەکی فێنك بەر دەروونم دەکەوت. ئیدی من لە جیهانێکی تردا بووم، تەواو جیاواز...

بەڵیّ یەکەم نوێژ... ئای خوایە! ئەمە چ خۆشییەکی لە باس نەهاتووە! بۆ یەکەمجار کڕنووشم برد. بەبیّ هەستانەوە هەر بە دانیشتنەوە دەچەمامەوە، مەگەر بەم شێوەیەش دەمتوانی نوێژ بکەم! پەروەردگارا! چەندە ئاسانکاری بۆ بەندەکانت دەکەیت! بەس ئەوەندە ڕووی تێبکەیت و داوای لێبکەیت.

زایەڵەی "الله أکبر"ی چوونە ناو نوێژەوە لە ڕۆحمدا تۆفانێکی بیّ وێنەی لە شەوق هەلایساند. خۆم پێنەگیرا و دەستم کردە گریان.

سات دوای سات لـه "ئـاه، ئـۆف"ی پەشـیمانی نەناسـین و دەرك پێنەکردنی مەزنی ئەو زاتـە و فراوانـی سـۆز و بەزەییەکەیدا دەتوامـەوە. مەگەر ڕووکردنە خواو، پاڕانەوە لێی و، چوونە دەرگانـەی بـەزەیی ئـەو و داوای لێخۆشبوون لە حزووریدا چەندە شیرینە ...

مرۆڤەکان! ! ! وەرن تکا دەکەم وەرن، با لەم هەستەدا هاوبەش بـین. شاهیدی تەوبە و ئاهەنگی گەڕانـەوەم بـن. بڕوانن کـە لـە هـەموو گونـاه و تاوانەکانم تۆبـە و دوورگیریـم کـردووە. ئێـوە مەکەونـە هەڵـەکانی منـەوە. گوناهەکانی مـن دووبـارە مەکەنـەوە. تـاجی کڕنوشـم نایـە سـەرم، ئـەمان پەروەردگارم! ئەی گەورەی گەورەکان، بەبەزەیترینی بەبەزەییەکان، ئەی خوایە گیان، ئیدی چی ترم لێت بووێت؟ ئەم ڕۆژانەشت نیشاندام.

خۆم پێنەدەگیرا، نەمدەتوانی بەر لە وەرینی فرمێسکەکانم بگـرم، ئـەم فرمێسکانە هی وەرزێکی ترو، هی جیهانێکی تر بوون، هاوتای هـەموو ئـەو فرمێسکانە بوون کە تا ئەمڕۆ لە کارێزی دڵمەوە هەڵقوڵابوون.

ئـەی خـوای میهرەبـانم، ئـەوەی تـۆی دۆزیوەتـەوە، چـی لـە دەسـت چـووە؟! ئەوەشـی تـۆی ونکـردووە، چـی دۆزیوەتـەوە؟! ئەسـرینەکانم پاکژکەرەوەی چڵك و زبڵەکانی دەروونم بوو، سارێژکەری زامـی قـووڵی بـێ ئاگایم بوو، لێزمەی دڵۆپە سوێرەکانی چاووم بـوو، گـەردەلوول و پووشـە خەرمانەی کەڵەکە بووی ساڵەهای تاوان و سەرپێچیمی لە خۆیدا بزرکرد.

ئاهـەکانم، کڕوزانـەوەکانم بوونـە خـۆری چـاوی ئاسمـانی پەشـیمانی و شەختە سەهۆڵی نەفسی بـەدخوازمیان توانـدەوە، ئیـدی پـەڕەی زسـتانی سەخت پێچرایەوە و بـەهاری خـەملاو هاتـە گـۆڕێ. بـەفرەکان توانـەوە و خونچەکان دەمیان کردەوە...

ڕۆحم لـه ئاسمانی شـەوقی ئیلاهیـدا بـەرزەفڕ بـوو، چـونکه چـیدی ئەهریمەنـەکان نەیانـدەتوانی ڕۆحـم بکەنـه بەنـدەی ئـارەزوە ئاژەڵیـەکان. ئاخر ئەو بۆ تەیکردنی ئاسۆکان دروستکرابوو نەك بۆ گەوزان لـه پۆنگـاوی نەفس و ئارەزووە نزمەکانیدا.

ئـەی پادشـای پادشـایان، لێـت دەپاڕێمـەوە فرمێسـکەکانم قبـووڵ بفـەرموو، داواکـانم مـەگێڕەوە، ئـەی خـاوەنی جیهانیـان، تـۆ ئەوانـه دەرناکـەیت کـه دێنـه دەرگانـەت، هێنـدەی کـەفی دەریاکـانیش گونـاه و تاوانیـان هـەبێت لێیـان دەبووریـت، منـی بەنـدەی گوناهبـارت، نغـرۆی زەلکاوی سەرکەشیم که جگه له دەرگای لێخۆشبوون و لێبوردەیی زاتی تۆ هیچ دەرگایەکی تر شك نابەم. هەموو پردەکان ڕووخاو و وێرانەن جگـه لـه پردی گەیشتن به چاوپۆشی تۆ. گەر میهری تۆ پـەنام نـەدات پـەنا بـۆ لای کـێ بـەرم؟ پـەروەردگارا! مـن دروسـتکراوی تـۆم. بەنـدەی تاوانبـار و شەرمەزاری تۆم. هەزارجار تۆبەم شکاند، بەڵام هەر بۆ لای تـۆ گەڕامـەوە. به دەستی بەتاڵ مەمگێڕەوە".

ئیتر له کاتی ئـەم دوعایانـەدا لـه هـۆش خـۆم چووبووم. سـەرله نـوێ ژوورەکـەم پـڕ بـووەوە لـه گریـان و لاڵانـەوە. ئاگـام لـه خـۆم نـەمابوو. پەرستارەکان به پەله هاتن. بۆ چەند کاتژمێرێك بـێ هـۆش مامـەوە. ئـیتر من له دونیایەکی تردا بووم. هەزارەها و ملیۆنەها جار بـەزەییم بـه خۆمـدا دەهاتەوە، بـەداخ و هەناسـەی پـڕ پەشیمانییەوە دەمـوت: "ئـاخر بـۆ تـا ئێستا لەم حەقیقەت و چێژە ئیمانییانه بێ بەش بووم؟".

ئەبرونوور هاته ژوورەوە بۆ لام. به ڕووخسارە گەشـەکەیەوە، هـەروەك هەمیشه هەواڵی پرسیم، پێم وت که دەستم کردووە به نوێـژ، بـه بیسـتنی

ئەم هەواڵە لە خۆشیاندا خەریك بوو دەفڕی، هێشتا تارمایی هەندێك لە پرسیارەکان لە مێشکمدا مابوون. جانتاکەی کردەوە و کتێبێکی دەرهێنا.

ئایسێڵ گیان، کتێبم بۆ هێناویت، لە بری ئەوەی وانە وانە پرسیار بکەیت و ماندووبیت، ئەم کتێبە بخوێنەرەوە. دواتریش گەر پرسیارت مابوو بپرسە. واتە ئەم کتێبە وەڵامی زۆرێك لە پرسیارەکانت دەداتەوە.



# ئەو پیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت

"ئەو پیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت"... نووسەرەکەی جەنابتان بوون، ئای خوایە، ساڵەها لەمەوبەر هاوسەری مامۆستای ماتماتیکی ئامادەییم ئەم کتێبەی پێدام، بەڵام ئەوەندەم بایەخ پێنەدا و نەمخوێندەوە.

ئەو ڕۆژەش سەرلەنوێ چەند بابەتێکمان لە "پەیامەکانی نوور" خوێندەوە و بە نێو باخچەی گوڵزارەکانیدا کەمێك گەشتمان کرد. ئەو پرسیارانەی لە مێشکدا مابوونەوە پرسیمن. ئەبرونوور ئەوەندە کەسێکی تێگەیشتوو بوو، هەرچیم بپرسیایە، بە تەرزێکی ڕوون و تەبا لەگەڵ ژێریدا وەڵامی دەدامەوە و سات دوای سات لە کەناری ئارامی و دڵنیایی نزیکتری دەکردمەوە.

ئەو شەوە دەستم کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکە، باسی لە کەسێکی وەك من دەکرد. ئەوە پەرتووکی ئەو کەسانە بوو کە خۆیان ونکردبوو و بەدەم ناڵەی "ڕزگارکەرێك نییە ڕزگارمان بکات؟" پەلەقاژەیان دەکرد.

بەسەرهاتی مامۆستایەك و کەسێکی بێ باوەڕ. جا لەو کتێبەدا چی نەبوو؟ ورد خوێندنەوەی ئەم کتێبە دەبێتە مایەی ڕامالین و بڕینی ئەو ئاستەنگ و پەردانەی بینای دڵ و ئاوەزیان داپۆشیوە و ڕێگرن لەبەدەم پەیبردن بە ڕاستییەکان. بە کورتی مرۆڤ بە بەدیهێنەرەکەی ئاشنا دەکات.

بوونی خوای گەورە بە بەڵگەی زانستی و زیرەکی دەسەلمێنێت و ئەو ڕاستییە دەچەسپێنێت کە گەردوون ماددەیەکی ئەزەلی و ئەبەدی نییە، هەروەك بێ باوەڕان گومان دەبەن. جگە لەوەی بانگەشەی ماددە پەرستان و بوونگەرایان لە بناغەوە هەڵدەوەشێنێت. چەندەها بەڵگە و حەقیقەتی تریش... سەرەڕای ئەو کۆتاییە هەست بزوێنە... گەڕانەوەی بێباوەڕێکی کۆمەنیستی بەناوبانگ و یەکەم نوێژی... کە ئەو "یەکەم نوێژ"ەم خوێندەوە، دەستم کردە گریان، گریام..گریام، دەموت: "ڕێك وەك منە، هەمان نمایشی زێڕین". ئیمان هێنان، کەرنەڤاڵی ئاشتەوایی لەگەڵ خوادا. پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوون...

چێژی ئەمە تەنها من دەیزانم، تەنها ئەوانە دەیزانن کە ئیمانیان لەدەستداوە و لە دوایدا پێی شاد دەبنەوە. "ئەو پیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت"، هەروەك پزیشکێك ڕەچەتەی مەعنەوی دەردەکانمی پێ بەخشیم و وەڵامی ئەو پرسیارانەشی دامەوە کە وام دەزانی بێ وەڵامن.



## محەمەدی دوزجەیی

ئەمڕۆ لەگەڵ باشترینی دونیا، فریشتە ئاسا، هاوڕێی گەشتی ئیمانم، ئەبرونووردا بووم...

سەرلەنوێ دەستمان کردەوە بەو وتووێژە شیرینەی کە هەرگیز لێی تێرنەدەبووم، ئەو شتانەشمان باسکرد کە پێویست بوو ئەنجامی بدەم. بابەتەکانی "پەیامەکانی نوور"یش ئاوی دڵ و ئیکسیری ژیان بوون.

ئەمڕۆش لە بابەتگەلێکی زۆر دووایـن. سوپاس بۆ خوا زۆرێك لە گرفتەکانم چارەسەربوون. بەر لەوەی لێم جودا بێتەوە، کتێبێکی تری پێدام. محەمەدی دوزجەیی...ئەمەشیان کتێبی جەنابتان بوو.

کاریگەری و کەمەندکێشی ئەم کتێبەیان شتێکی تر بوو. ئەم کتێبە کتومت من و ژیانەکەمی لە ئامێزی دێڕەکانیدا پەنادابوو. محەمەد گەنجێکی لووتبەرزی سەرکەش لە خەڵك، لە ژیان، لە خوا، ئەی سەرەنجام؟ سەرتاپا بەسەرهاتێکی ڕاستەقینەی پەندئامێز بوو. لەم کتێبەدا بەکۆمەڵە بابەتێکی گرنگ و هەستیار ئاشنابووم، کە بووە وەڵامگۆی زۆرێك لەو پرس و گومانانەی ساڵەها بە دوایدا وێڵ بووم و نەشمدەدۆزییەوە، بەڵکو لەوانەشە یەك لەو هۆکارانەی بوونە مایەی بێ باوەڕی و نکوڵی کردنم مانەوەی ئەم پرسیارانە بووبێت بە هەڵواسراوی.

مامۆستا گیان، بەهەموو هەست و پێزانینمەوە سوپاستان دەکەم و منەتباری ئێوەم بۆ ئەو کتێبە بەپێزەتان ...

**دەمەوێت هەڵوێستەیەکی خێرا بکەم لەسەر هەندێك لەو بابەتانەی کە سەرەنجیان ڕاکێشام:**

یەکێك لەو بابەتانە، لەژێر ناونیشانی:

**"ئەو زاتەی هەزارەها نیعمەتی پێ بەخشیووین، بەخۆڕایی دەیدات؟"**

بوو.

ئەم بڕگەیەی خوارەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام:

"ئەو زاتەی ئێمەی ناردووەتە دونیا و ناز و نیعمەتی ناکۆتای خۆڕایی پێ بەخشیووین، ئێمەی بۆ ئامانجێك ناردووە، ئەو کاتیش کە دەمان باتەوە، لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکات، چونکە هەر کڕین و فرۆش و مامەڵەیەك بەرامبەر و نرخی خۆی هەیە".

زۆر دروستە، هەموو کڕین و فرۆشێك دەبێت بەرامبەرێکی هەبێت.

* ئەم ڕاستییەم چۆن لەیاد کردبوو؟ چلۆن هەستم پێنەکردبوو؟

یەکێکی تریش لەو بابەتە گرنگانە بەشێك بوو لەژێر ناونیشانی:

**"گەردوون سەرەتایەکی هەیە، کەواتە کۆتایشی دەبێت."**

ئەمە بۆ من باسێکی فرە بایەخداربوو، چونکە بناغەی ئەو بیرەی کە بانگەشەم دەکرد، بریتی بوو لە "ئەزەلی بوونی ماددە".

ئەمە ئەوەی دەگەیاند کە ماددە سەرەتایەکی نییە، کۆتاییشی نابێت، هەروەك شتێك نییە بەناوی ئەندازەگیری و نەخشەی بوونەوە.

بەم شێوەیەش (حاشا) پێویست بە بوونی پەروەردگار ناکات.

بەڵام بەخوێندنەوەی ئەو چەند دێڕە بۆچوونەکانم ژێراوژوور بوون، هەڵبەت ئەو بەشەشی لە ژێر ناونیشانی **"کێ ئێسکە پرووکاوەکان زیندوو دەکاتەوە؟"** بوو، وەرچەرخانێکی دیاری لە 'بیرکردنەوەمدا سازاند.

تەنانەت ئەم برگانەم لێ لەبەر کردووە:

" لەناوچوونی ژیانی ماددی مرۆڤ و گەڕاندنەوەی پاش مردن، ئەکرێت لە تێگەیشتنەوە بەدوور بزانرێت. وەلێ پێویستە ئەو ڕاستییە لەیاد نەکەین کە دەتوانرێت گشت تایبەتمەندییە ماددییەکانی مرۆڤێك لە شریتی زانیاری کە بە (DNA) ناسراوە و، ڕووبەری ١ لە ١٠ ملیاری سەری دەرزییەکی سەرخڕ داگیر دەکات، تۆمار بکرێت.

ئەمە ڕاستییەکی زانستییەو بەتەواوی پشتڕاست کراوەتەوە. ئەگەر ئەو شریتی زانیارییە(DNA)انە توانای شکۆفەو گەشەکردنیان لەناو خاکدا هەبوایە، ئەوا ئەوکات (DNA)ی هەموو ئەو مرۆڤانەی کە هاتوون و دێنە سەر زەوی پڕ لە پەرداخێك دەکرا و دەخرایە ژێر خاکەوە. ئەوسا هەروەك تۆوی درەختەکان زیندوو کردنەوەیان گونجاو دەبوو.

"مەگەر لە توانستی ئەو کردگارە دانا و توانا ڕەهایە بە دوور دەزانرێت مرۆڤ زیندوو بکاتەوە، کە خاوەنی ئەو ڤایرۆسە ناوازانەیە کە چەندەها سەدەو بەبێ تێکچوون لەژێر خاکدان و هیچ جۆرە ڕەوشێکی زیندەگیش نیشان نادەن، کەچی هەر ئەوەندەی ژینگەیەکی لەباریان بۆ دەڕەخسێت بە فەرمانی پەروەردگاریان ژیان پێکدێننەوە!"

ئەو پەروەردگارە کاربەجێیەی، کە گەردوون و گشت بەدیهێنراوانی ناوی لە بەرزترین و جوانترین تەرزدا بەدیهێناوە، بەویست و دانایی خۆی ئەو پەرداخە پڕ لە (شفرە)یە ڕۆدەکاتە زەوی و بە فەرمانی"ببە" دانە دانەیان زیندوو دەکاتەوە و لە حزووریدا گردیان دەکاتەوە".

یەکێکی تر لە تابلۆ ڕەنگینەکانی نێو گەشتەکەم: "ئایا ئێمە مەحکوومی قەدەرین؟" "پەروەردگاری دانا و زانا هەر لە لەدایکبوونمانەوە تاوەکو مردنمان، بەزانستی ئەزەلی خۆی دەزانێت چی هەڵدەبژێرین، چیمان دەوێت، چ شێوە ژیانێك ئارەزوو دەکەین و ئیرادەمان چۆن بەکاردەهێنین.

هەموو ئەمانە پێش لەدایك بوونمان دەزانێت و بەپێی ئەم ویست و هەڵبژاردنانەی خۆمان قەدەرمان دەنووسێت. بەو واتایەی خوای گەورە بەپێی زانینەکەی (زانینی تەواوەتی هەرچی بووە و دەبێت، پێش ئەوەی ببێت) کە ویست و هەڵبژاردنەکانی ئێمەش دەگرێتەوە قەدەرمان تۆمار دەکات. هەربۆیە مافی ئەوەمان نییە -حاشا- خوای گەورە و قەدەر تۆمەتبار بکەین، بەڵکو دەبێت ویست و ئیرادەمان تاوانبار بکەین کە بەهەڵە بەکارمان هێناوە".

## خاوەن ئیمانی ڕاستەقینە، بەختەوەرترین کەسی دنیایە...

کاتێك کە "محمدی دوزجەیی"م تەواو کرد، بۆم دەرکەوت کە ئیمان سەرچاوەی هێز و وزەیەکی ئەوتۆیە، ئەوەی پێی شادبێت، دەبێتە بەختەوەرترین کەسی دنیا.

پێویستە دانبنێم بەوەدا کە:

ئەوانەی باوەڕیان بە پەروەردگار نییە، لە ژیاندا بێ ئومێد و دڵ تەنگن، گەر دڵخۆش و شادمانیش ببینرێن، ئەوا ماکیاژ و ساختەیە.

هەرچەند مرۆڤ بانگەشەی ئەوە بکات کە:"باوەڕناهێنم، شتی وا نییە".

کەچی لە قووڵاییەکانی دەروونییەوە زایەڵەی (خوا هەیە، ئەوە بەدیهێنەرت) دەبیستێت و دڵی بێ ئاگای ڕادەچڵەکێنێت.

من هەرگیز نەمتوانی ئەو هاوارە سەرکوت بکەم.

ئەوە دەنگی خاوێن و سازگاری سروشتی ئادەمیزادە، ئەوە سەدای (بەڵێ)ی جیهانی ئەرواحە.

تەنانەت لە سەرکەشترین ڕۆژگارەکانی بێ باوەڕی و ترازانیشمدا هەستم بە نوزەی ئەم هەستە دەکرد، شتێکی سەیر بوو، بەردەوام وام هەست دەکرد شەپۆلێکی نامۆ بەڵام زۆر ناسك، ناسك لە دەنگیدا، ناسك لە ڕووخساریدا لە کەنارەکانی ڕۆحم نزیك دەبێتەوە و بە ئەسپایی دەیوت و دەیوتەوە:

"خوا هەیە، هانا بۆلای ئەو بەرە".

بەڵام بێچارە خۆم، بە هیچ چەشنێك دڵم نەدایە، نەم دوواند ...

هەموو ئەم ملەجیڕییانەش لەپای بیروبۆچوونە چەوت و فریودەرەکانمەوە بوو.

ئەمە تاوانی کۆمەڵگایە، سوچی پەروەردەیە.

ئەگەر گەنجەکان بە ئیمان و ئاراستەیەکی تەندروست پەروەردە نەکرێن، ئەوا دەبنە تاکێکی سەرکەش و زیانبەخش بۆ خۆیان و کۆمەڵگاش. ئەوجا کات زۆر درەنگ دەبێت بۆ وتنی: "بۆچی گەنجەکانمان گێرەشێوێن و ڕێسا شکێنن؟".

جا با ئەوانەی لەم بەرپرسیارێتییەدا پشکیان هەیە گوێیان لێبێت و لەتاوا بلەرزن.

دڵنیام لەوەی گەر خوای گەورە جارێك لە ئێمە بپرسێتەوە، سەد جار لە ئەوان دەپرسێتەوە.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی باسەکەم دەمەوێت بڕگەیەکی ژیانی خۆم وەك نموونە بهێنمەوە:

ئەوکات کە لە یاسا دەمخوێند، جارێکیان بانگهێشت کراین بۆ کۆبوونەوەیەك. دیسانەوە خاك و میللەت و تەنانەت هەموو جیهانمان ڕزگار دەکرد!. هەر هەڤاڵێك دەچووە سەر سەکۆ بۆ وتاردان، قسەی ئاگرینی بە ڕاست و چەپیدا پەخش دەکرد. جا منیش چونکە هۆشم لای خۆم نەبوو پچڕ پچڕ لە قسەکان دەگەیشتم.

جارێکیان یەکێك لە هاوڕێ ناسراوەکانمان وتاری دا، ئەو یەکێ بوو لە سیما دیارەکان. هەر لەپزیشکییەوە بیگرە تا یاسا و وێنەکێشی و نووسەری لە هەموو ئەمانەدا خاوەنی باسکێکی بەهێز بوو. ئەو ئەندازیاری بیری ئێمە بوو. جا هەرچەندە بۆچوونەکانی توند و تیژیش بوون، بەڵام هەمیشە لە نێو ئاپۆڕای چەپڵەڕێزاندا پێشوازی لێدەکرا، خاوەن دەربڕینێکی ڕەوان بوو. بە وتەکانی جۆش و خرۆشی گوێگرانی دەبزواند.

ئەو قسەی بۆ دەکردین:

"یەکجار دەژین، کە مردیشین هەموو شتێك کۆتایی پێدێت. ناتوانن بۆ جارێکی تر سۆماکانتان هەڵبێننەوە. ئەم دۆستایەتی و خۆشییەشتان چاوپێ ناکەوێتەوە. دەستبەرداری ئەو بیرۆکانە ببن کە دەڵێت: "سەرلەنوێ ژیانەوە و زیندووبوونەوە" یان "جیهانێکی تری هەمیشەیی" ئەوانە کۆمەڵە بیرۆکەو باوەڕێکی دوور لە ژیری و زانستن، ئێمەش و گەردوونیش ماددەین، کە مەرگیش هات هەموو شتێك کۆتایی پێدێت.

مەترسن، جگە لەخۆتان، کەس ناتوانێت لێپرسینەوەتان لەگەڵدا بکات. گیرۆدەی پابەندی حەڵاڵ و حەرام و شتی وا مەبن، ئەوانە بیر و بۆچوونی چاخی ناوەڕاستن. ئا ئەمەیە ژیانی پڕ چێژ و خۆشی".

پەیتا پەیتا چەپڵەڕێزان... ئەمە هەڤاڵ (سەرکان) بوو، لێپرسراو و بیرمەندی ڕابەرمان.

لەپاش ماوەیەك بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لێمان جیا بوەوە. دواتر پێمان زانی کە گەڕاوەتەوە و دەستی کردووە بە نوێژ کردن، لەکاتی خۆیدا نەمانتوانی لێکدانەوەیەك بۆ ئەم ڕووداوە بکەین.

بەڵێ، ئێستاکە تێدەگەم کە هەڤاڵ (سەرکان) بەم ڕاستییانە شادبووبوو. بڕوا بکەن گەر سەرپەرشتیاران، مامۆستایان، دایکان و باوکان ئەم ڕاستییانە بۆ گەنجان باس بکەن، ئەوا هیچ جۆرە لە یاسا دەرچوون و یاخی بوونێك لە کۆمەڵگادا ڕوونادات، بەڵام بۆچی باس ناکرێت ؟!!

مامۆستا گیان، دەمەوێت ئەمڕۆ نامەکە لێرەدا بوەستێنم چونکە زۆر درەنگ بووە، هەرچەندە ماندوو بووم بەڵام بە ئاسوودەیی دەخەوم. خوا گیان ئاسودەیی ببەخشێتە هەمووان.

بەیانی بۆ نوێژ هەڵدەستم، ئیدی بەرنامە ڕۆژانەکەم بەپێ ی نوێژەکان بەڕێوە دەچێت.

# بەشی پێنجەم

## ژیانەوەو هەستانەوە
## لەسەر جێگای مەرگ



پوختەی ئەم بەشە:

پەرجوویەك هاتە بوون. لەکاتێدا کە چاوەڕوانی مەرگ بووم، ژیانێکی نوێ و ژیانەوەیەکی نوێ دەستی پێکرد. ئەم دیمەنەی ژیانم کە فرمێسکەکانم بەرماڵەکەم تەڕدەکەن، بەڕووی تەمەنێکە...

# ئیدی من ئایسێڵەکەی جاران نیم

مامۆستا، سەرلەنوێ نامە بۆ جەنابتان دەنووسم.

بــە شــەوق و تاســەوە چــاوەڕوانی نوێــژەکانمم، ئەمــە چــێژێکی لەرادەبــەدەرم پێدەبەخشــێت. لەهــەر جارێکیــدا خۆشــتنێکی مەعنــەوی، پاکژبوونەوەیــەکی نــوێ، ڕۆحــم دەشــواتەوە و نیگــاری ژیانــەوەی تێــدا دەنەخشێنێت.

ڕاوەستان لە حزووری پەروەردگاردا بەرەو جیهانێکم ڕاپێچ دەکات. بە درێــژایی نوێــژەکانم جەســتەم ســەرتاپا لــەرزین دایــدەگرێت. ئــەوجا ڕۆحــم بەرزەفڕ دەبێت و بەرەو مەملەکەتی چێژی ئیمان باڵدەگرێت.

خوای گەورە لە خاتوو ئەبرونوور ڕازی بێت و لە هەردوو دنیا پاداشــتی بداتــەوە. هەفتەیــەك بەســەر یەکترناســینماندا گوزەشــتووە. زۆر دڵنیــام لەوەی کە ئایسێڵەکەی هەفتەیەك بەر لە ئێستا نیم.

بەهەر حاڵ (گەڕانەوە) و (گۆڕان) بەمە دەوترێت.

هەر ڕۆژێکمان بەوێنەی بەرنامەیەکی چڕوپڕی خوێندنگا بەسەردەبەین. پەیامــەکانی نــوور، جەوشــەن و پرســیار و وەڵام... نــازانم چۆن ڕۆژەکــان تێدەپەڕن.

ڕۆح و دڵم بەتەواوەتی لە زیندانی نەفسم ڕزگاریان بووە، ڕۆژە ئەولاتر چووەکان شوێنەواریان نەماوە، لەناو شەرمەزاری و پەشیمانی گوناه و تاوانەکانی ڕابردوومدام.

ناتوانم بڵێم: "لە نێوەندی ئەو ژیانە قێزەونەدا ڕۆڵ و تاوانی من چی بوو؟".

چونکە زۆرێك لە هەڵەکانم لە دەستدا بوو، بێ ئاگایی و ملنەدانم بووە ئاستەنگ لەبەردەم شادبوونم بە سەرچاوەی ژیان و ئیمان.

بەڵام من کچێکی تەنهای بێ کەس و بێنەوا بووم. چواردەوریشم کەسانی بەدنیاز و بەدڕەوشت. گیرۆدە و گرفتاری زەلکاوی گوناهی ئەوتۆ بووم کە ژیانمی تاریك کرد، دەروازەکانی هیوای بەڕوومدا داخست، کردمیە کۆیلەی نەفسی بەدخواز. دەمزانی هەڵەم، تاو ناتاو لەگەڵ چەوتی و خراپەکانمدا دەکەوتمە سەنگەرەوە، بەلام تەنیا بووم، سەرکەوتوو نەبووم. ئێستاش لەکۆتایی ڕێگادا بەندەیەکم خوای خۆم دۆزیوەتەوە، لە تاو ئازار و کوڵی قورسی بێ گوێیی و، فەرمانشکێنیم تاقەتم پڕووکاوە و دڵم زۆر ڕەنجاوە. ئەی ئەگەر خوا قبووڵم نەکات؟ ئەی ئەگەر پەروەردگار لە هەڵە و گوناهەکانم خۆشنەبێت، چی؟

ئەم ئەگەرانە و هاوشێوەکانی ناخمیان هێنابوویە کوڵین.

بۆ ساتێکیش بێت ناتوانم ئەم بیرانە لە مێشکم دەربکەم. دەزانم بەزەیی و لێبوردەیی پەروەردگارم فراوانە، لە هەر نوێژو، هەر کاتژمێرو، هەر چرکەیەکدا هەست دەکەم لە حزووری پەروەردگاردام.

ئیتر لەبەر ئەمەیە کە ناتوانم بەر لە شەپۆلی بەردەوامی فرمێسکەکانم بگرم.

ئەگەر چاوەکانیشم لێکبنێم، دڵ و ناخ و هەموو بوونم بۆ حاڵی بەندەیەکی بێ توێشووی ستەم لەخۆکەر دێنە ناڵە و گریان. بابەتی ئەمڕۆمان لەگەڵ هاوڕێی لەدایك بوونەوەم (ئەبرونوور) "سۆز و بەزەیی پەروەردگار" بوو.

تاکە گوڵەکەم ئەبرونوور بۆ دڵدانەوەی من ئەم بابەتەی هەڵبژاردبوو.

ئەو ئایەت و فەرمایشتانەی دەربارەی لێخۆشبوون و بەزەیی بوون لای خۆم تۆمارم کردن، بەڕاستی دڵیان دامەوەو بوونە مێرگی دڵنیایی بۆ منی وێڵی نێو بیابانی ئارەزوو پەرستی.

تێیان گەیاندم کە تاکە پرشنگێکی خۆری بەزەیی و لێخۆشبوونی خوایی سەر و زیادی تواندنەوەی شەختە سەهۆڵی گوناه و سەرپێچییەکانمە. ئا بەم جۆرە ئاگری بڵێسەسەندووی ناخم کەمێك ڕەوییەوە. دۆست و خۆشەویستی خوا "مەولانا"ش پەی بەم گەنجینەیە بردووە، هەر بۆیە ڕوو لە بیمار و دڵ هەڵقرچاوان دەفەرمێت:

"دیسانەوە بێ... دیسانەوە بێ

هەرچییەك هەی... دیسانەوە بێ

ئەمە خانەی ئێمەیە، نە خانەی نائومێدی

گەر سەد جاریش تێك دابێ تەوبەت... دیسانەوە بێ !"

مامۆستا (نوورسی)ش دەفەرموێت: "بەدەستهێنانی ئیمان یان لەدەستدانی، بابەتێکە پەیوەندی بە هەموو مرۆڤێکەوە هەیە".

خۆ لادان، قوتاربوون و ڕووبەڕوو نەبوونەوەی ئەم تێزە چارەنوسسازە چ گونجاوە !!

جا ئیتر ئەوە من، من بەتەنها لە نێو ئەو گێژەڵووکەیەدا.

گرنگی و هەستیاری بەدەستهێنانی ئیمان و مەترسی لەدەستدانی بەجارێك لەرزەی هێنایە گیانی ساواو بێ دەستەڵاتمەوە.
واهەست دەکەم لەپشت ئاسۆکانی داهاتووەوە ڕووداوگەلێکی دەرئاسا بەڕێوەبن و شانۆی کۆتاییەکی پەندئامێز نمایش بکەن.

## گەورەترین ئامانجی مرۆڤ بەدەستهێنانی ئیمانە..

ئەو میوانی میوانانە، فریشتەی ڕاگەیەنەری کۆتایی ژیانە.
هەرچەندە بەناوبردنی گوڵی هیواو ئاواتەکان دەژاکێت، بەڵام ئەو فەرمانبەرداری فەرمانی خواوەندی شکۆمەندە.
تامەزرۆی چاوەڕوانکراوێکی نادیارم تا ئەوەی بێت و بە "فەرموون"ەوە ڕاسپاردەکەی پێشکەش بکەم. ئێستا کە تەمی خەیاڵاتی خاوم لەبەر ڕەویوە، تێدەگەم کە گەورەترین ئامانج و سەرەکیترین مەبەستی مرۆڤ دەبێت بەدەستهێنانی (ئیمان) بێت.
ئیمانێک کە مرۆڤ لە تەنگەبەرەکانی زەمینەوە بەرەو بەرزی و فراوانییەکانی ئاسمان دەردێنێت. ئیمانێك کە بەندەکان لە بەندایەتی بەندەکان بۆ بەندایەتی خوای بەندەکان بڵند دەکات. چونکە سەرئەنجام ئەوە تاکە بلیتی ڕزگاربوونە. لەودەمەدا کە هەمووان چۆکدادراو و، زمان شکاون، ئەو دەبێتە تکاکار.
لەو کاتەدا هیچ هێز و هیچ شتێك یاریدەی مرۆڤ نادات. نە دۆست نە هاوڕێ، نە پێشکەوتوویی، نە زەنگینی... تازە خەریکە لەواتای ژیان تێدەگەم و گرێکانی دەکەمەوە، مەگەر ژیان یەك واتای هەبووە: **بەدەستهێنانی ئیمان یان پێچەوانەکەی.**
هەموو لێپرسینەوە و مامەڵەکانیش لەسەر ئەم بنەمایە دێنە ئەنجام.

"خوایە گیان کۆمەکیم بکە، بێرە فریام، شەرمەزارم، پەشیمانم، سوێی سەرپێچییەکانم ڕۆحم دەگوشن، لە دوا سات و، دوا ڕۆژەکانی ژیانم، جگە لە زاتی تۆ پەنا و داڵدەی ترم نییە".

"دیسانەوە سوپاس بۆ تۆ خوایە گیان، بە ئەندازەی گەردیلەکانی بوون منەت و ستایش بۆ تۆ پەروەردگارم. گەر لەسەر مل نەدانم بەردەوام بوومایە دۆزەخی هەمیشەیی جێگەم دەبوو و بۆ هەتا هەتایە لە بینینی دایك و برا و باوکم بێ بەش دەبووم... ئای کە سەخت و دڵتەزێنە".

## کەعبەی پیرۆز و بینینی دایکم

مامۆستای ڕێزدارم، لە ئامێزی ڕووداوێکی وادا ژیام کە دوودڵ بووم لەوەی بۆت بنووسم یان نا. بەڵام بەهۆی پێداگری دەستگیرانەکەی خاتوو ئەبرونووره و بڕیارمدا لەگەڵ جەنابتاندا بەشی بکەم. بەڵام وردەکارییەکانی نانووسم، چونکە تەنانەت بە بیرکردنەوەش لێی هێز و هۆشم لەدەست دەدەم.

وا هەشت ڕۆژ بەسەر فێربوونی قورئاندا تێپەڕیوە، ئێستا دەتوانم خۆم بەتەنها بیخوێنمەوە. بەتایبەتی دوای نوێژی خەوتنان و پێش نوێژی بەیانیان دەیخوێنمەوە.

هەرچەندە لە ماناکانیشی تێناگەم بەڵام وا هەست دەکەم هەر پیتێکی بۆخۆی بەهارێکە و بەگوڵە شۆخەکانی سەرمەستم دەکات و بەدەم شنەیەوە دڵم دێنێتە جۆش.

بڕوام پێبکەن هەرکات دەست دەکەم بەخوێندنەوەی قورئان، ئازار و ناڕەحەتییە جەرگ بڕەکانم کە کسپە لە ویژدان دێنن و ئۆقرە لەڕۆح دەبڕن، لە دۆسیەی بیرمدا دەسڕێنەوە، ئەمەش کەرامەتێکی ڕوونی قورئانی پیرۆزە. لەم وەرزە دڵڕفێنەدا و لەکاتێکدا لەنێو ئاسۆکانی ئەم

کەشەدا دەفرِیم، ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەر لەدەرگای ژیانی دام کە هێشتا لەژێر کاریگەرییەکەیدام. ئەمە تەنها وەك سوپاسگوزاری و بەمەبەستی پەند وەرگرتن دەینووسم. ڕووداوێکە وشە لەپەسەندکردنیدا دەستەوسانە و قامکەکانم هێزیان لێبڕاوە.

"پەروەردگارا، تۆ گەورەی گەورەکانی، پارێزەر و پشتیوانی ستەم لێکراوانی و بەندەکانی خۆت لەیاد ناکەی، ئەوەتا لەخەونیشدا بێت ئەو هەستە نیان و جوانانە بەم بەندە بێ فەرەی خۆت لوتف دەفەرموویت".

دوێنێ بەیانی، ئامادەباشیم بۆ نوێژ کرد و کاتژمێرێك پێشتر هەستام. کەمێك قورئان و جەوشەن و چەند پەرەیەکیشم لە "ڕابەری خوشکان" خوێندەوە. گەلێك سوودم بینی و هەستم بەئارامییەکی بێ وێنە کرد.

بەملکەچییەوە لەبارەگای پەروەردگارمدا وەستام و دەستم کرد بەنوێژ.

ناچارم بیلێم... ئیدی نوێژەکانم بوونەتە وادەی بەیەکگەیشتنی دوو خۆشەویست، شادبوونی بەندەی کۆڵەوار و بیمار بە پەروەردگاری دلۆفان و بە بەزەیی.

کاتێك کە دەست دەکەم بەنوێژ، بوونی پەروەردگار بەهەموو شکۆ و مەزنییەوە هەست پێدەکەم و لە حزووریدا بەهەموو ملکەچی و دەستەوسانیمەوە کڕنووش دەبەم. پاڕانەوە لێی... داوای چاوپۆشین... هەستکردن بەبێ دەسەڵاتی خۆم و توانا و دەسەڵاتی ئەوزاتە... باس ناکرێت، ئەستەمە باسکردنی.

بەردەوام دەپاڕامەوە و نزام دەکرد تا ئەوەی خوای گەورە، بەردەوامیم لەسەر پەرستش پێ بەخشێت و کۆتاییەکی بەخێریش بکاتە خەڵاتم.

ئای چ خەڵاتێك لەمە گەورەترە!

"خوایە گیان بیکەیتە نسیبم، شایستەی ئەو لوتفەم بکە".

لەنێو ئەم ڕاز و هەستانەدا، فرمێسکەکانیشم کەوتبوونە گریان، هێوەر نەدەبوونەوەو نەدەگیرسانەوە، ئەی دڵم، دەتوت دڵی باڵندەیەکی بێ چارەیە لەنێو دەستی منداڵێکی لاساردا. جا لەوکاتەدا ڕووداوەکە خۆی نمایشکرد:

ئەو کەعبەیەی کە تەنها لەوێنەدا بینیبووم بەهەموو شکۆمەندییەکیەوە لەبەرامبەرمدا وەستابوو. بەگوزارشتێکی دیکە، من لەناو ئەو دیمەنانەدا بووم. هەزارەها موسوڵمان بەدەنگی زوڵاڵی "الله أكبر، الله أكبر" ڕوو لەکەعبەی پیرۆز نوێژیان دادەبەست. لەنێو سەرسامی و هەژانێکی بێ هاوتادا تەماشای دیمەنەکانم دەکرد. حەز و تامەزرۆیی ئەو شوێنە هەموو دەمارەکانمی خستە بزاوت. ئەمە ئەندێشە نەبوو، چونکە بەر مرۆڤەکان دەکەوتم و گوێم لە قسەکانیان دەبوو. دەپاڕامەوە "خوایە گیان چی دەبێت تکایە با ئەمە خەون نەبێت".

دەستێك بەر شانم کەوت و بە نەوایەکی پڕسۆزەوە وتی: "ڕۆڵەکەم" ئەوجا باوەشی پێداکردم.

– دایە گیان...

براکەشم لەتەنیشتیەوە ڕاوەستابوو. دیسانەوە باوکمی لێنەبوو، کە پرسیاریشم کرد هەمان وەڵامم وەرگرتەوە.

– نەیتوانی بێت، چونکە تا ئێستا لێپرسینەوەکەی تەواو نەبووە.

ئای ئەمە چ چێژێکە، توند باوەشم بەدایکمدا کردو و تا توانیم بۆنیم کرد. ئەی برا ئازیزەکەم، ئەویشم لەئامێزگرت.

ئەوجا دایکم وتی:

– کچی خۆم، پیرۆزباییت لێدەکەم، تۆ دەستت کردووە بە نوێژ و خوێندنەوەی قورئان. ئای چەندە خۆشحاڵ بووم، چەندە!

نزا و پاڕانەوەی زۆرمان بۆ کردیت. ئێمە هەموو هەینییەك لەخزمەتی شانازی بوونەوەران، پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ داین.

کەواتە پەروەردگاری میهرەبان دوعا و پاڕانەوەکانی گیراکردووین. پاك و بێگەردی، سوپاس و ستایش بۆ تۆ پەروەردگارم! دەی وەرە، دەتبەمە خزمەتی سەروەرمان ﷺ.

ئەی خوایە گیان، من! بەندەیەکی گوناهبار و بێ گوێی وەك من، شتی وا دەبێت؟

بەخزمەتی ئازیز ﷺ شەرەفمەند بووین، ئەم بەندە تاوانبارەی ئومەتەکەیان قبووڵ فەرموو. هەروەها فەرموویان: "لە ڕۆژێکی پیرۆزدا بانگت دەکەین".

هاتمەوە سەرخۆم، هێشتا لەنوێژدا بووم.

ئاخر چۆن لەو گەشتە تێربم؟ چۆن بەرگەی ئەو دیمەنانە بگرم؟

"خوایە گیان! بمکەیتە شایستەی ئەو نیعمەتانە. ئەو دیمەنانەم بۆ بکەیتە ڕاستەقینە. بەدەستی خاڵی مەمگێڕەوە، شەرمەزارم مەکە، بەزەیی و لێبووردەیی تۆ لەهەموو تاوان و گوناهەکان گەورەتر و فراوانترە".

بەڵێ، زۆرباش تێگەیشتم مامۆستا، پێدەچێت ماڵئاوایی کردنم لەدنیا لەڕۆژێکی پیرۆزدا بەنسیب بێت.

ئەو ڕۆژە پیرۆزە، دەگونجێت ئەم هەینییە بێت، یاخود یادی بەرات بێت کە بەڕێوەیە. هەردووکیشیان زۆر نزیکن، کەواتە تێدەگەن، گەشتیارم بەرەو پادشای پادشایان، بۆ لای خاوەنی جیهانیان دەڕۆم.

بەهەمموو تاوان و سەرپێچییەکانمەوە... بە ملکەچییەوە دەچمە بارەگای ئەو زاتە.

دیسانەوە هێزم لەبەر برا، تکایە کەمێکی تر مۆڵەت...

## بە ئەمینەی هاوڕێم شادبوومەوە

ئەمڕۆ بۆ من دەستپێکی کۆتاییەك بوو، ڕووخساری دوو ڕووداو پەردەیان لەسەر خۆیان لادا. یەکەمیان زۆر خۆش، ئەوی دیشیان زەنگی ئاگادار کردنەوەی ڕۆژە کۆتاییەکان بوو. کۆشکی بوونم لە ڕووخاندایە. ئەمە ئەنجامی پشکنینە پزیشکییەکانە. لێرەوە تیشکی مەرگ لەوپەڕی تونێلی ژیانەوە بە ڕوونی دەبینم. بەرهەڵستی جەستەشم ئاماژە بۆ ئەمە دەکات. جاری وا هەیە ئازارەکانم تا ڕادەی بەرگەنەگرتن دەمگەوزێنن، تەنانەت دەرمانە بێهۆشکەرەکانیش کاریگەرییان نابێت.. بەڵام سکاڵا ناکەم. ئایا مافی کاری لەوجۆرەم هەیە؟ چونکە جەستەو ژیانم هی من نییە. هەر ئەوە ژیان بەخش و خاوەن هەڵسوکەوتە لەموڵکەکەیدا هەرچۆن بیەوێت، ئێمە تەنها ڕاسپێردراوین. ڕاسپێردراویش تەنها چاودێری ڕاسپاردەکەی دەکات نەك بوونە خاوەنی.

دووەمیشیان مژدەی گەیشتنی ئەوکەسەی کە چاوم لە ڕێی بوو و، تینی بیرکردنم بلێسەی سەندبوو بۆی.... ئەمینەی هاوڕێی دڵسۆز و ئازیزم. ئەمڕۆ سەرلە بەیانی دەرگای ژوورەکەم کرایەوە و هەروەك پەری خۆی کرد بە ژووردا. هەموو ئازارو پەژارەکانم بەجاریٚ چوون بەهەوادا. ئەمە ژووانی پڕ چاوەڕوانی دوو دۆستی دێرینی یەکتر بوو. ئەمە... ئەمە ئاواتی دڵێکی بیٚ پەروا بوو....

خوات لیٚ ڕازیبیٚ کاکی کارمەند، ئەمینەی دیتبووەوە، ڕاستی بڵێم ئەمینە ئەو و منیشی دۆزیبووەوە. کاتێك کە دەبرامە خوارەوە بۆ

پشکنین، ئەمینە لەوێ منی بینی بوو. هەڵبەتە بەهۆی باری ناجێگیرو پەرێشانمەوە بە زەحمەت ناسیبومیەوە.

کاتێکیش کە بۆ سۆراخ هاتبووە سەرەوە بە جەنابی کارمەند گەیشتبوو. پرسیاری منی کردبوو. ئەویش زانیبووی کە من عەودالی ئەمینەم بۆیە بێ سێ و دوو هێنابوویە لام. خۆ ئەمینە خوێندکاری ئەم کۆلێژە بوو. واتە ئێمە لە دووی ئامینەی پاڵ دەستی خۆماندا دەگەڕاین.

ئاه ئەمینە ئاه! تۆ چەندە هاوڕێیەکی دڵسۆزیت، چەندە دۆستێکی بە وەفاو خەمخۆریت. بۆ گەیاندنی ئەم ڕاستییانەو ڕزگار کردنی هاوڕێکەت لە چڵکاوی تاوان چیت نەکرد؟ چەند جار بە دوومدا ڕاتکرد؟ دەبێت چەند ئاواتەخواز بوویت کە بەدڵ گوێت بۆ بگرم! چەند شەو لە تاو من خەو لە چاوانت تۆراوە و پێخەف لە ژێر پێتدا لول بووە! ئەمدیواو ئەودیو، تلاو تل دەتوت: "پەروەردگارا ڕێنموێنی ئایسێلی هاوڕێم بکە، لەم زەلکاوە ڕزگاری بکە. ئەمینەم تۆ هاوەڵی ڕۆژانی سەخت و تەنیایم بوویت، بڕوانە ئێستاش هەروا.

بوونی ئەم گەنجانە و هاوچەشنیان لە کۆمەڵگادا پێویستییەکی بنەڕەتییە. گەرنا کۆمەڵگە بەهۆی سەرکەشی و دەستدرێژی ئارەزووە نزمەکانی ئەم توێژەوە هەراسان دەبێت و بەدبەختی و داڕمان چارەنووسی دەبێت. ئەمینە بە زمانە هەنگوینی و دڵە گەورە پڕ سۆزەکەیەوە هەوڵی دڵ دانەوەمی دەدا و لە دواڕۆژو چێژی ئیمان دەدوا.

هەردووکیان ئەبرونوور و ئەمینە وەکو فریشتەی پارێزەر لاسەریان بەرنەدەدام و بە تەنیا جێیان نەدەهێشتم.

ئیدی ئەوانیش دەیانزانی کە کۆشکی ئەم جەستەیە لەمە زیاتر بەرگەناگرێت و وادەی ماڵئاوایی نزیکە. ئەمینە لە دۆسیەکەم

وردبووبووەوە، بەڵام وەختێك هاتەژوورەوە دیار بوو هەوڵی دەدا هەست بە هیچ نەکەم، وەلێ لە نیگا خەمناکەکانیدا ترسناکی و بێ ئومێدییەکی قووڵ و دژواری، بارەکە دەخوێنرایەوە.

دووبارە بە سۆزو بەزەییەوە بە توندی و بۆ ماوەیەکی زۆر لەئامێزی گرتم پێی دەوتم: "چاك دەبیتەوە، مەترسە!"

بەڵام ئاشکرابوو کە ئاوازی دەنگەکەی شتێکی تری بە گوێی دڵمدا دەچرپاند: "خۆت ئامادە بکە، ڕێبواریت"

## چاوەڕوانی ساتەوەختی بەیەکگەیشتنی فریشتەی گیان کێشانم

ئیتر من ڕێبوارم. ڕۆژەکانی گەیشتنە حزووری پەروەردگار و میوانداری فریشتەی گیانکێشان بەتاسەوە دەبژێرم.

لە ڕەش کردنەوەی ئەم دێڕانەدا دوایەمین هێز و وزەم بەکار دێنم. پایزێکی ڕەنگ بزرکاوی لەرزۆکم. بەم زووانە مەرگی زستان کفنی جودایم پێ دەپۆشێت.

نە دەتوانم هەستم، نە داشنیشم، نوێژەکانیشم بە هێما ئەنجام دەدەم.

مامۆستا گیان، تەماشای کارسازی کردگار بکە، بە چ مەبەستێك ئەم نامەیەم نووسی و ئێستاش بە کوێ گەیشتووە!

ئەم بەسەرهاتە نامەیەی کە لە سەرەتادا بە مەبەستی خۆکوشتن دەستم دایە، بەبێ ویست و نیازی خۆم بەدەم تەوژمەکانییەوە بەرەو کەنارەکانی ڕزگاری و بارەگای خوایی گواستمیەوە.

سوپاس و ستایشی نەبڕاوە بۆ تۆ خوایە گیان...

مامۆستا گیان، داواکارییەکم لێتان هەیە. جەنابتان سەدەها بەڵکو هەزارەها خوێندکارتان پێگەیاندووە. لە نێوان ئەمانەدا چەندەهایان ڕاستە ڕێگەیان دۆزیوەتەوە و بە ئیمان شاد بوون.

تکاتان لێ دەکەم، دوعام بۆ بکەن، داوای لێخۆشبوونم بۆ بکەن منی هەژاریش وەك قوتابییەکی خۆتان قبوڵ بفەرموون. مادام ئێوە مامۆستان، کەواتە لێپرسراوییشتان بەرامبەر من هەیە. تکادەکەم گەر چوون بۆ سەردانی ئەمیرداغ، بارلا، ئیسپارتە، یان ئورفە، سڵاو و حورمەتی ناشایستەی قوتابی گوناهبار "ئایسێل" بە مامۆستا نوورسی بگەیەنن.

لەکاتی خوێندنەوەی قورئان و لەدەمی نزاو پاڕانەوەکانتاندا ئەم قوتابییەشتان لەیاد مەکەن و بێ بەشم مەکەن. توخوا لە یادتان نەچێت.

ئەم نامەیە بۆ من بووە هەوارگە و لەکانگای ئومێدیدا تینوێتی مەستی شکاندم . بووە سوارچاکی ئەسپی دڵنیایی لەگۆڕەپانی حەقیقەت تاودرام. فریادڕەسێك بوو تریفەی مژدەبەخشی بەگشت کووچەکانی ناخمدا پەرش کرد...

کە سپێدەی شەونمی لێڵی تارمایی دەشڵقاند و دەنگی کەڵەبابەکان گزنگیان بە خەبەر دەهێنا، دڵم ئۆقرەی نەدەما، دەستم دەدایە نووسین و هەر دەمنووسی، دەمنووسی تا نووزە لە دەنگی وشەکانم دەبڕا. ئەمە کڵپەی چ ئاگرێك بوو، لێزمەی بارانی چ وەرزێك بوو؟

ئیتر من و نامە، ناونیشانی دوو ئەویندار ی بێ ناز. ئەم نامەیە تاکە میرات و شاهیدی منە و بەڵگەنامەیەکی زیندووی دانپیانان و پەشیمانییەکانە. پشتیوان بەخوا خوێنەرانی و بیسەرانی نزای بەخێرم بۆ دەکەن و نەفرین ناکەن لە "ئایسێل" ی گوناهبار...

هەم نامەکەم تەواو بوو هەم خۆیشم، لەوانەیە ئەم کۆتا دێڕانە دوایەمین وشەکانم بن، هەینییەك بە سەر خەونەکەمدا تێپەڕیوە، بەڵام تەمەنم کۆتایی پێ نەهات. دوو ڕۆژی ماوە بۆ یادی بەرات، خوا یار بێت شەوی چوارشەممە بە پەرستش و نزا و پاڕانەوە ئاوەدان دەکەمەوە.

مامۆستای ئازیزم، گەر ئەم نامەیەت بەدەست گەیشت، دەخوازم دوعای تایبەتیم بۆ بکەیت، خۆ گەر لە خزمەتتاندا بوومایە دەستەکانتم ماچ دەکرد. مەخابن، بەڵام نامەکەم لەبری من ئەمە دەکات.

دڵنیام لەوەی لە بارەگای پەروەردگاردا بە خزمەتی مامۆستای "محمدی دوزجەیی" شاد دەبم. زۆر سوودم لە کتێبە بەنرخەکانت وەرگرت، بەشداری بەرچاو و پشکی گەورەتان هەیە لەهۆکاری ئیمان هێنانمدا.

موڵك و بەندەی خوام و بۆلای ئەو دەگەڕێمەوە. لە پەروەردگارم ئومێد دەکەم کە بە ئیمانەوە بممرێنێت و هەرواش بمباتەوە حزووری خۆی، جا با ئەم نامەیە شایەتی ئیمانم بێ. مامۆستا گیان بە خواتان دەسپێرم، خوای گەورە یارو پشتیوانتان بێت بۆ پێگەیاندنی قوتابی زیاتر.

ڕێزو حورمەتم قبووڵ بفەرموون، دەستەکانتان ماچ دەکەم.

**قوتابی گوناهبارت**

**ئایسێل**

## خوێنەرانی ئەم نامەیە
## پێویستە بە خۆیاندا بچنەوە

پێکەوە لەگەڵ هاوسەرەکەمدا نامەکەمان خوێندەوە، سڕ بووبووین. تەنانەت بیرکردنەوەش لەو ژیانە تەزووی بە جەستەماندا دەهێنا و مووەکانی گرژ کردبووین. ئەمە بەسەرهاتی ژیانێکی باوەڕ پێنەکراو بوو. دان بەخۆداگرتن لەبەرامبەر ئازارەکانی کچێك کە هەر لە تەمەنی منداڵییەوە تاڵاوی مەینەتی و ناسۆری چەشتبوو، هەرگیز ئاسان نەبوو، تا دەمانخوێندەوە خورپەی فرمێسکەکانمان پتر دەبوو. هاوسەرم بە شەفەقەتی دایکانەوە دەپاڕایەوەو دەیوت: "خوایە گیان کەس گیرۆدەی دەردی وا نەبێت".

لە کاتی نووسینی نامەکەدا، ئایسێل نەیدەتوانی بەردەوام بێ و تاو تاو پشوویەکی دەدا. ئێمەش لەو ساتانەدا هەناسەیەکی قووڵمان هەڵدەمژی و پشوویەکمان دەدا. جارجارەش پێکەوە لە سەر نامەکە وتووێژمان دەکرد، هەڵەکان، قوربانییەکان، نیازە خراپەکان بە دەربڕینی ئایسێل "دڕندەکان" لە پێش چاوانماندا نمایش دەبوون.

سەرو بەندی ئەو ژیانەی لەنامەکەدا باسکرابوو، نەك تەنها کەسێك، بەڵکو هەروەك بڵێی هەموو هەڵەو چەوتییەکانی کۆمەڵگەی ڕووبەڕووی لێپرسینەوە دەکرد. هەڵبەتە پشکی سەرەکی لەم ڕووداوانەدا بۆ"ئایسێل" خۆی دەگەڕایەوە. ڕەتکردنەوەی ئەو هەموو دەستی هاوکارییە، پشتگوێ

خستنی ئەو خەونە سەیرەی سەرەتا بینی و بایەخ نەدان بەو پەیامانەی نێو ڕاسپاردەکانی دایکی... نەماندەزانی دڵتەنگ بین؟ بگرین؟ یان تووڕەبین؟

نامەکە کۆتایی هات. لە گەڵیدا ئێمەش دواییمان هات. ئەوە وەك بڵێی نامەیەکی ئاسان نەبوو، بەڵکو بەڵگەو تۆمارێکی مێژوویی بوو سەبارەت بە چۆنیەتی پەلەقاژە کردنی وەچەیەك لە پۆنگاوی بێ ئیمانیدا.

دەبوو کێ تەماشای ئەم ژینە بێ پەروایەی کچێکی بێ بەش لە دین و ئیمانی بکردایە و شەرم داینەگرتایە؟

بەرپرسان، دایکان و باوکان، مامۆستایان، تاك تاکی کۆمەڵگا... ئەم نامەیە دەبێت بگاتە دەستی زۆرێك، هەمووان بیخوێننەوەو هەرکەس سەبارەت بەو هەڵەیەی کە ئەنجامی داوە لە خۆی بپرسێتەوە.

ئەمڕۆ ئایسێل، سبەی کەسانی دی... ئەو تەڵە و پیلانانەی بۆ کۆمەڵگە سازکراون زیاتر چاوەڕوانی گەنجەکانن.

دوای خوێندنەوەی نامەکە ئەم بابەتە جارێکی دی خۆی لە مێشکمدا زیندوو کردەوە "ئیمان مرۆڤ دەکات بەمرۆڤ، کوفریش مرۆڤ دەکاتە ئاژەڵێکی دڕندەی لە ڕادە بەدەرو، نە توانا".

" گەر ئیمان نەبێت، یاخود بەهۆی سەرپێچییەوە کاریگەری نەمابێت، ئەوا سەرەڕای ژیانێکی ڕووکەش و، چێژ و لەزەتێکی کورت خایەن، هەزارەها پلەی ئەو چێژو لەزەتانە، ئازار و خەفەت و ناخۆشی دەبەخشێت"[1].

---

١- کتێبی (وتەکان) دانراوی م. سەعیدی نورسی.

ئەوجا تەماشای مامۆستا بەدیعوززەمان بکەین چۆن بە نموونەیەك گوزارشت لە پەرۆشی و تاسەی زریان ئاسای ڕۆحی دەکات لە پێناو ڕزگارکردنی ئیمان و چارەنووسی مرۆڤایەتیدا:

"ئاگرێکی گەورە و سامناك لە بەرامبەرمەوە کەوتۆتەوە. کڵپە و بڵێسەی بەرەو ئاسمانەکان بەرزدەبێتەوە. لە نێویشیدا ڕۆڵەکەم، ئیمانەکەم گڕی گرتووە و دەسووتێت. لە کاتێکدا کە بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە هەڵپە دەکەم، لە ڕێگادا یەکێك قاچ دەخاتە بەر پێم و، پێم لێی دەکەوێت. ئاخر ئەمە لە بەرامبەر ئەو ڕووداوە سامناکەوە کەی جێی بایەخە".

بەڵێ، ئیمانی گەنجەکانمان دەسووتێت.. لە سووتاندایە. بڵێسەی ئەم ئاگرە چارەنووسی بەرەیەك دەکاتە خۆڵەمێش. گەر "ئاگر کوژێنەرەوەکان" بەزوویی ئەم ئاگرە خامۆش نەکەن، گشت کۆمەڵگا سرەوتی لێ زەوت دەبێت و دایکان و باوکان بەردەوام دەبن لە سکاڵا و کاربەدەستانیش گیرۆدەی گێرەشێوێنان دەبن.

تاکە چارەی ئەم درمە کوشندەیەش هەڵکردنی بەیداخی ئاشتەواییە لەگەڵ خواناسی و خودناسیدا.

بیربکەنەوە! ئایا دەگونجێت هیچ زیانێك لە مرۆڤێکەوە بێ کە باوەڕی بە زیندووبونەوە و سزا و پاداشتی دوارۆژ هەبێ، یان ناپاکی بەرامبەر بە نیشتیمانەکەی ئەنجام بدا؟؟؟ مەحاڵە.

نامەکەی بەردەستمان زیندووترین شاهیدی ئەمەیە...

دەبوو چیمان بکردایە؟ هەموو ئەندامانی خێزان لەمە دەدواین. هەر دەبوو شتێکمان بکردایە. هەر چۆنێك بووایە دەبوو خۆمان بگەیەندایەتە ئەم کچەمان کە لەدوا ساتەکانە ژیانیدا بوو... بەڵام چۆن؟ لە کۆتایی

نامەکەدا تەنها ناو "ئایسێل"ێك دەتوانرا بخوێندرێتەوە. نە بەروار نە شوێنی مانەوە ئاشکرانە بوو. تاکە شتێك کە دەزانرا ناردنی نامەکە بوو لە ئەنقەرەوە. ئەی دواتر...

## لە ئەنقەرە بەدووی ئایسێلدا دەگەڕام

نامەکەمان لەگەڵ سەرجەم ئەندامانی خێزان هەڵسەنگاند، هەردەبوایە شتێکمان بۆ ئایسێل بکردبا، وەلێ لەنامەکەدا تەنها "ئایسێل" نووسرابوو. نە بەروار نە ئەو نەخۆشخانەیەی کە تیایدا دەمایەوە ئاشکرا نەبوون، ئەوەندە هەبوو کە نامەکە لە ئەنقەرەوە نێردرابوو. بەو پێیەش کە لە ژێر چارەسەری شێرپەنجەدا بوو، دەبوایە سۆراخی هەموو ئەو نەخۆشخانانەمان بکردایە کە خاوەنی هۆبەی چارەسەری شێرپەنجە بوون. دەستبەجێ چووم بۆ ئەنقەرە و دەستم کرد بە گەڕان لە نەخۆشخانەکاندا، بەدووی نەخۆشێك بەناوی ئایسێل، تەمەن ٢٢ساڵ دەگەڕام. تاکە مەراق و پەژارەم ترسی دواکەوتنم بوو، چونکە نامەکە لە سەرەتادا بۆ ئەو خانەی چاپە ڕۆشتبوو کە کتێبەکانم بڵاودەکاتەوە. ئەوجا لەوێوە بۆم نێردرابوو. واتە زیاد لە مانگێک دوا کەوتن لە ئارادابوو.

دواجار لەهۆبەی چاودێری شێرپەنجە لە نەخۆشخانەیەکی گەورەدا شوێنەواریمان دیتەوە، بەڵام مەخابن ئەوەی لێی دەترسام ڕووی دابوو، هەرواش بوو، درەنگ کەوتبووم. چونکە ئایسێل لە شەوی بەراتدا لە شەقەی باڵی دابوو و وەفاتی کردبوو.

یەکێك لە کارمەندانی هۆبەکە وا دیاربوو دەیناسیم، هاتە پێشەوەو باوەشی پێداکردم، بەڕێزتان خالید ئێرتوغرولن؟ بەخێربێن... ئێمە زۆرسوود لەکتێبەکانتان دەبینین... ئیتر لەمەوە بە یەکتر ئاشنا بووین،

ئەم کارمەندە هەمان ئەو "کاکی یاریدەدەر"ە بوو کە لەنامەکەدا ناوی هێنرا بوو. ئەوجا بە هاورێکانی تریشی ناساندم. منیش ئارامم لێ بڕابوو خۆم پێ ڕانەدەگیرا، بۆیە بێ سێ و دوو چوومە ناو بابەتەکەوە و باسم لەو نامەیە کرد کە ئایسێل بۆی نووسیبووم.

لە پاش قسەکانم کاکی یاریدەدەر بە ڕوانینێکی مانابەخش تەماشای کردم و وتی: بەڵێ ماملاستا گیان ئاگادارم، چونکە من ئەو نامەیەم نارد. جار جاریش یان هەندێك لە نووسینەکانی بۆ دەخوێندمەوە یان بەسەرهاتەکانی بۆ دەگێڕامەوە.

منێك کە لە تاو پەژارەی نەبینینی ئایسێل دەتلامەوە، وا ئێستاکە پەروەردگار شاهیدێکی دوایەمین ساتەکانی ئەو ژینە پڕ ئەسرینەی لەبەردەممدا ڕاوەستاندووە. بۆیە بەو تاسەمەندییەوە پرسیم: زۆر مەراقی دوا ساتەکانیم، چۆن بەڕەحمەتی خوا چوو؟

بەم قسانە چاوەکانی کاکی یاریدەدەر پڕبوون لە فرمێسك. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە ئازارێکی پڕ هەستەوە هاتە گۆ: ماملاستا گیان مەپرسە مردنێکی تەواو سەیر بوو، دەتوت دەچێ بۆ ئاهەنگ یان چاوەڕوانی جەژنە. دەنگی بەڕێز یاریدەدەر کەوتە لەرزە و قسەکانی بۆ تەواونەکرا، فرمێسکەکانی لەکانی چاوانییەوە تەقی و بەرەو ڕوومەتەکانی ڕێچکەیان گرت، لە نێوەندی تەوژمی توندی هەنسکەکانیدا ئەم وشانە بەزەحمەت خۆیان قوتار کرد: خوای گەورە مردنێکی لەم جۆرە بە نسیبی ئێمەش بکات. تابلۆکە بەم جۆرەبوو، دوو دڵی پڕ تاسەو جۆش لە بەرامبەر یەکترەوە کە چاوەکانیان کردبووە ئاوێنەی دڵی بێ ئۆقرەیان. ئەم کەشە هەست بزوێنە تا قووڵایی خانەکانی جەستەمان پەلی کێشابوو، دەتوت هەوری ماتەم ئاسمانی گیانمانی تەنیوە. کۆتایی هاتنی ژیانێکی

بێ سەروبەرەی پڕ لە سەرپێچی بەم جۆرە، بێ شك واتاگەلێکی زۆرو هێمای پەند ئامێزی لەدووتوێی خۆیدا جەم کردبوو.

ئەم بەسەرهاتە نموونەیەکی کاریگەری پەیامی ئیلاهییە، تاوەکو هیچ بەندەیەك لەم گەشتی ژیانەدا بێ هیوایی بەرۆکی نەگرێت و گرفتاری نائومێدی نەبێت.

## لەنێو دانبەخۆداگرتنێکی زۆردا گوێ بیستی وتەکانی بەڕێز یاریدەدەر بووم

– بەرەبەیانی بەرات بوو کە بەڕەحمەت چوو، دەستگیرانم ئەبرونوور و هاوڕێی کۆچکردوو خاتوو ئەمینە، تا دواسات هاودەمی بوون. لە پاش گیان سپاردنی، هەموو کارمەندانی بەش بەدەم تەرمەکەیەوە هاتن و لێپرسراوانی شارەوانیش ئەسپەردەی خاکیان کرد.

دەستگیرانم تاوەکو ئێستاش لەژێر کاریگەری ئەو دیمەنەدایە و بەردەوامە لەگریان و دەپاڕێتەوە: "پەروەردگارا، مردنێکی بەوشێوەیە بە نسیبی ئێمەیش بکە".

**تامەزرۆیی خۆمم بۆ بینینی دواساتەکان دەربڕی....**

کاکی یاریدەدەریش کە هەستی بەم حاڵەتە کرد وتی: لەڕاستیدا ئێمەش لەدووی ڕێگەیەك دەگەڕاین دەستمان بگاتە بەڕێزتان. تکا دەکەم ئەمشەو میوانی ئێمە بن. دەستگیرانم و خاتوو ئامینەش بانگهێشت دەکەین. ئەوان خوازیاربوون بەدیدارت بگەن، لەهەمان کاتدا سوودێکی بێشوماریشیان لەکتێبەکانتان دیتووە. گەر لەخزمەتتاندابین، دڵخۆش دەبین.

## ڕێکەوتین...

شەو لەماڵی ئەمینە کۆبوینەوە، باوکی ئەمینە خانەنشین بووبوو، بۆ ئەوەی ئەمینە بەتەنها نەبێت هاتبووە ئەنقەرە. ئەمینەش، خوێندکارێکی زیرەك و خاوەن داهاتوویەکی گەشی کۆلێژی پزیشکی بوو.

لەو ژوورەی کە لێی دانیشتبووین کتێبخانەیەکی گەورە و دەوڵەمەندی لێبوو. لای سەرەوەی "سەرجەمی پەیامەکانی نوور" ڕازاندبوویەوە و گشت کتێبەکانی منیش لەڕەفەکاندا دانرابوون.

باوکی ئەمینە خاوەن کەسایەتییەکی سەنگین بوو، مرۆڤێکی ڕۆشنبیر و بەئەزموون... بابەتەکەمان (ئایسێل) بوو و ئامادەبووانیش زۆر باش (ئایسێل)یان دەناسی. نەخوازەلا ئەمینە و باوکی کە بۆ گۆڕینی ئاراستەی چەوتی ژیانی ئایسێل هەوڵی زۆریان بەخەرج دابوو.

هەرچی یاریدەدەر و دەستگیرانەکەشیەتی تا دوایەمین ساتەکانی لەتەکیدا ببوون و هاوکاری زۆریان کردبوو و بووبوونە سەرچاوەی ورە و متمانە بۆی.

ئایسێل دەیزانی لەبەراتدا کۆچی دوایی دەکات، هەر کە ئەبرونوور خانم دەستیکرد بە گێڕانەوەی دواساتەکانی ئایسێل، بێ دەنگییەکی قووڵی پڕ لەماتەم باڵی بەسەر هەمواندا کێشا.

هەر لەیەکەم وشەوە دەتوت ئەبرونوور شتێك لەگەرووی گیراوە. چەند جارێك ویستی بەکۆکین ڕزگاری بێ لێی، بەلام سەرکەوتوو نەبوو. لێوەکانی گرژ بوون و ئەسرین لەچاوانییەوە هاتە خوارەوە و یەکبینە ئەمینەش کە لەتەنیشتییەوە دانیشتبوو خۆی پێنەگیرا و ئەویش دەستی کرد بە گریان. دیاربوو کە مردنی ئایسێل زۆر پەندئامێز بووە.

بەڕێز یاریدەدەر ویستی دەستگیرانەکەی ئارام بکاتەوە، هەمووان لە هەوڵی دامرکاندنەوەی ئەو لێزمەی هەست و شەپۆلی تاسەیەدا بوون. پاش کەمێك ئەبرونوور خانم کەوتەوە باسکردن:

– بەرات بوو، ئەو ڕۆژە، لەگەڵ ئەمینەدا ڕۆژووەکەمان لە ژوورەکەی ئایسێل شکاند.

ئاخر ئەو کە نەیدەهێشت بچین بە هیچ لایەکی تردا!

چەند ڕۆژ بوو چاوەڕوانی بەراتی دەکرد. ئەوەندە متمانەی هەبوو کە لەو شەوەدا دەمرێت، هەموو ئامادەکارییەکانی بە گوێرەی ئەوە سازدابوو.

چەند ڕۆژێکیش لەوەو پێش هەر دەیوت: "یان ڕۆژی هەینی، یان بەرات...."

هەر کە هەینی تێپەڕی وتی: کەواتە بەرات وادەی بەیەك گەیشتنە.

دەیوت: ئەو میوانەی کە چاوەڕوانیم ئەم شەو دێت.

ئایسێل لەم دواییانەدا بە کەشێکی ئیمانی پێناسە نەکراو شاد ببوو. ئیدی ئەو گەشتیاری ترۆپکە زومرودییەکانی دڵ بوو.

بە هەموو گیان و سەرجەم گەردیلەکانی بوونییەوە ڕووی کردبووە پەروەردگار و داوای لێخۆشبوونی لێدەکرد. ئەی ئەو نوێژانەی کە دەیکردن، سەرتاپا دیمەنی پڕ پەندی دەنواند. لەو باوەڕەدام لە هەر جێیەکدا نوێژی کردبێت، ئەو جێگەیەی بە بەرامەی کەعبەی پیرۆز بۆندار کردووە.

لەماوەیەکی کورتدا فێری خوێندنەوەی قورئان بوو و ڕۆژانە قورئان و جەوشەن و پەیامەکانی نووری دەخوێندەوە و قسەی بۆ دەکردین.

لەڕاستیدا ژوورەکەی کردبووە مزگەوت و فێرگە، یان بەدەربڕینێکی تر کردبوویە قوتابخانەی خۆئامادەکردن بۆ دوارۆژ.

زۆر زرنگ بوو و تێگەیشتنی لە بابەتەکان لە ئاستێکی بەرزدابوو. لەهەموو نادیارەکانی دەپرسی و نەیدەویست هیچ شتێك بە بێ وەڵام بمێنێتەوە.

لەنێو "ئاە" و "ئۆف"ی ئەو گوناە و سەرپێچییانەدا بوو کە بەدرێژایی بیست و دوو ساڵی تەمەنی ئەنجامی دابوو.

دەتوانم بەوپەڕی دڵنیاییەوە بڵێم کە تا ئێستا شاهیدی پەشیمانییەکی ئاوها و تۆبەیەکی ڕاستەقینە و تاسەی لێخۆشبوونێکی لەم شێوەیە نەبووم.

ئەو زۆر دەمێك بوو سەختی و ئازاری نەخۆشییەکەی لە بیرکردبوو. وەرینی قژو برۆکانی، دەرەنجامە هیوا بڕاوەکانی پشکنینە یەك لە دوای یەکەکان، هەموو ئەمانە بەلایەوە گرنگ نەبوون. ئایسێل ئیتر تاقانە ئامانجێکی هەبوو: ئەسپەردەکردنی ڕۆحی بە ئیمانەوە...

لە کۆتا ڕۆژەکانیدا ڕەنگ و ڕووخساری هێندە نوورانی و پەری ئاسا دەینواند دەتوت بوەتە فریشتە، زۆرجار هەروا تەماشای ڕوخساریم دەکرد. چێژم لە درەوشانەوەی ئەو نوورەی سیمای دەبینی. ئەو ڕۆژەش کە (محەمەدی دوزجەیی) خوێندەوە زۆر گریا و بە کوڵ دەپاڕایەوە: "خوایە گیان! دوا هەناسەیەك لەو جۆرەش بە نسیبی من بکەیت." چەند جارێکیش پێغەمبەرمان ﷺ هاتبووە خەوی، گەرچی جار جارە بەشێك لە خەونەکانی بۆ ئێمەش دەگێڕایەوە، بەڵام دڵنیام لەوەی زۆرێك خەونی پڕ ڕازی تری هەبوون کە نەی دەدرکاند.

ئەوەی ڕاستی بێت ئێرەییمان بەم حاڵەی ئایسێلْ دەهات، ئەمانە چ نیعمەتگەلێکی گەورەبوون؟ ئای خوایەگیان دەتوت ئەوەی نەخۆش و ئاتاجی کۆمەکی بوو، ئەو نەبوو، بەڵکو ئێمە بووین، ئیتر ئێمە داوای دوعامان لەو دەکرد. کۆتا ڕۆژ واتە ڕۆژی بەرات هەموو ئامادەکارییەکانی تەواو کردبوو، زۆر شەکەت بوو و بەزۆر قسەی دەکرد.

## ئایسێلْ و چاکبوونەوەی بەر لە مردن

ئەبرونوور بەردەوام بوو لە قسەکانی و، ئێمەش لە نێو لافاوێک لە دڵە تەپێ و هەست بزواویدا گوێبیستی ئەو تابلۆ هەژێنەرانە بووین.

– پێکەوە لەگەڵ ئەمینەدا هەستمان بە گۆڕانکارییەک کرد لە ئایسێلدا. حاڵەتێک هەیە لە نێو خەڵکیدا بە "چاك بوونەوەی بەر لە مردن" ناسراوە. واتە تا نەخۆش لە ساتە وەختی مردنی نزیك بێتەوە، گشت ئازار و ئێشەکانی لە بیر دەچێتەوە، پشوودەدات، بە جۆرێك وا دەردەکەوێت کە چاك بووبێتەوە. ئایسێلیش هەمان حاڵەتی بەسەردا هات. ئایسێلْ کە گرفتاری ئێش و ئازاری زۆر سەخت و قورس بووبوو، لە پڕێکدا هەروەك بڵێی ئازارەکانی کۆتایی هاتبێت، هاتەوە هۆش خۆی و کەوتە قسە. لەم نێوەندەدا ئەمینە کەوتە دووان:

"چاك بوونەوەی بەر لە مردن" دیاردەیەکە لە زانستی پزیشکیدا جێگەی سەرسوڕمانە و بابەتێکە شیاوی نکۆڵی لێکردن نییە. چالاك بوون یاخود بەهێزبوونێکی کاتییە لە ئەرکەکانی مێشکدا، لەو کەسانەدا دەبینرێت کە نزیك دەبنەوە لە ساتەوەختی مردنیان. زۆر نموونەی لەم شێوەیە بینراوە، کاتێك نەخۆشەکە لە چرکەساتی مردنی نزیك دەبێتەوە لە پڕێکدا حاڵەتێکی وەك چاکبوونەوە و هاتنەوە سەر خۆی بەسەردا دێت.

لەبەر زۆر بینران و ڕوودانی ئەم دیاردەیە، ناوێکی تایبەتی لێ نراوە و پێی دەوترێت: چاك بوونەوەی بەر لە مردن.

لێکۆڵینەوە پزیشکییەکان حاڵەتی چەندین نەخۆش تۆمار دەکەن کە سییەکانیان تووشی شێرپەنجە هاتووە و توانای هەناسەدانیان نەماوە، وەلێ دواساتەکانیان بەتەرزێك کە ئاوەزی ئادەمی لە تێگەیشتنی دەستەوسانە، بەهەناسەدانی ئاسایی کۆتایی هاتووە.

کەواتە "چاکبوونەوەی بەر لە مردن" چییە؟ ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەگەر مرۆڤ تەنها بریتی بووایە لە ماددە، بەنزیك بوونەوەی مردن دەبوایە زیادبوونی تێکچوونی ئەرکی ئەندامەکان و سەختی هەناسەدان پتر ببوونایە. دەبووایە مرۆڤ لە ژێر چڕنووکی ئازارێکی بەسۆدا دوایی بهاتایە. لەکاتێکدا ڕووداوەکان پێچەوانەی ئەمە پشت ڕاست دەکەنەوە.

واتە ئەو چەرخەی کە بەخراپی دەڕۆیشت لەدواساتدا ڕێك دەبێتەوە. هەروەك بڵێی لەجیهانی پەنهانەوە، شنەی ژیانێکی تایبەت و کورتی ئاسوودە هەڵدەکات بۆیە ئەم ڕووداوانە و هاوچەشنیان هێزی ناکۆتا و دەرئاسای ڕۆح لەبوونیاتی ئادەمیدا پێش چاوان دەخەن.

لە ڕاستیدا مردن چەشنی لەدایك بوون "جێ گۆڕین" و "بوون گۆڕین"ە.

جا بۆئەوەی خواوەند ئەم ڕازەمان تێبگەیەنێت، دیاردەی "چاکبوونەوەی بەر لە مردن"مان نیشان دەدات.

لەکاتی مردندا، جگە لەچاکبوونەوەی بەر لە مردن، بۆ نموونە لەوکەسانەدا کە گیرۆدەی تەنگەنەفەسی و ئازار نەهاتوون، مێشکیان چالاکی و ژیانەوەیەك بەخۆیەوە دەبینێ. یادگە دانە دانەی دۆسیە دوورەکانی دەکاتەوە، لەدەروازەی جیهانێکی نوێدا، هەروەك بڵێی

پانۆراماکانی ژیان نمایش دەکرێت. مێشکی مرۆڤ لەدواساتەکانیدا، بژاردەترین وتەکانی دەردەبڕێت. جا ئەگەر مردن کۆتایی مرۆڤ بووایە و مرۆڤیش لەماددەی کۆتا هاتووی بەرەو نەمان چوون پێك بهاتایە دیاردەکە تەواو پێچەوانە دەبوو.

واتە دەبوو ئەو مێشکەی کە بەرەو نەمان دەچێت، ئەرك و فەرمانەکانی لەدەست بدایە و مەرگیش هێدی هێدی پەردەی بەسەر رووخساری ژیاندا بدایەتەوە.

لەڕاستیدا ئەمە بەڵگەیەکی روونە لەسەر بوونی ڕۆح و دەیسەلمێنێت کە مردن تەنها گۆڕانێکە نەك کۆتایی و نەمان.

لەمە گرنگتر حیکمەتی پتر دەرك کردنی مرۆڤە بە ڕاستییەکان لەساتەوەختی نزیك بوونەوەی مەرگدا.

زۆرجار بینراوە ئەوکەسەی لە سەرەمەرگدایە، چەوت بێژی و وڕێنەکانی نامێنێ و هەواڵگەلێك سەبارەت بە داهاتوو بە دەوروبەرەکەی ڕادەگەیەنێت.

مەزنترین دیاردەی لایەنی مەعنەوی مرۆڤ هەستی پێش وەختە، هەستی پێش وەختیش بریتییە لەهونەری زانینی ڕووداوەکان پێش ڕوودانیان. ئەم دیاردەیەش کەم تا زۆر لەهەموو کەسێکدا بوونی هەیە. بەڵام ئەوەندە هەیە ڕاڤەکردنی ئەم دیاردەیە بەگوێرەی بونیاتی ماددیمان کارێکە مەیسەر نابێت. هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە ڕووداو و دیاردە ماددییەکان پابەند و سنووردارن بە کاتەوە. هەرچی هەستی پێش وەختیشە بریتییە لەبازدان و تێپەڕاندنی سنوورەکانی کات. ئەوەی لێرەدا جێی ئاماژە بۆ کردنە تێکەڵ نەکردنی هەستی پێش وەختە لەگەڵ هەواڵدانی بێ بنەمای جادووگەران. لەسەرچاوە پاراسایکۆلۆژییەکاندا

هەزارەها نموونە هەن کە لە چوارچێوەی ڕێساکاندا ئەم دیاردانە پشت ڕاست دەکەنەوە. لە نێویاندا ئەوانەی کە کارەساتی فرۆکە پێش ڕوودانی وەك خۆی دەبینن و ئەوانەش کە سات و تەنانەت شێوازی مردنی خۆیان لە جەنگەکاندا بینیوە. ئاشکرایشە ڕێژەی ئەوانەی هیچ گرفتێکی تەندروستیان نەبووە و هەواڵی ڕۆژی مردنی خۆیان داوە لەسەرو هەزارانەوەیە. پەروەردگاری مەزن بە "چاکبوونەوەی بەر لە مردن" دوایەمین بواری ئامادەسازی بە بەندەکانی دەدات.

ئەم لێکدانەوانە لەوپەڕی گرنگی و ناوازەییدا بوون.

ئەبرونوور لەپاش ڕوونکردنەوەکانی ئەمینە، دەستی کرد بە تەواوکردنی قسەکانی:

– لەگەڵ ڕەوینەوەی ئازارەکانی ئایسێڵ و هاتنەوە هۆش خۆی، ئەو پێشهاتانەش دەستیان پێکرد کە ئێمەیان سەراسیمە خست.

ئا لەو کاتانەدا بوو کە هاتە گۆ و وتی: "ئاوم بۆ بێنن، دەستنوێژ دەگرم، ئیدی میوانەکانم دێن. دەمەوێت بە دەستنوێژەوە پێشوازییان لێبکەم".

لەجێگەکەیدا دەستنوێژی گرت، بەڵام ئەوەی جێی تێڕامان بوو، هیچ گرنگییەکی بەئێمە نەدەدا. ئیدی ئەو وەك مرۆڤی دنیایەکی تری لێهاتبوو. سەرجەم ڕوانین و، بزاوت و بایەخەکانی ڕووەو شتانێك بوون کە لەلایەن ئێمەوە نەدەبینران.

"بڕوانن، بانگ دەدرێت، ئەم بانگە بۆ منە، پێم دەڵێن خۆت ئامادە بکە".

لەڕاستیدا ئێمە گوێمان لەبانگ و شتی وا نەبوو، وەلێ ئایسێڵ پێوەندانگە زەمینییەکانی بەزاندبوو و لەجیهانێکی مەعنەویدا دەژیا، ئەو زۆر شتی

دەبینی و دەبیست بەڵام ئێمە ناتوانابووین لەبینینی ئەو شتانەی کە ئەو دەیبینین.

ئەوجا ڕاست بوویەوە و لەسەر ئەژنۆ دانیشت و دەستی خستە سەر ئەژنۆکانی، بە خشوعێکی بێ وێنەوە چاوەڕێی تەواو بوونی بانگی کرد.

لەپاش کەمێك ئەم وتانەی لەزار دەرچوو: "بانگەکە تەواو بوو، ئیدی دێن تا بمبەن".

## دایە گیان دێت ..

گوێ ڕاگرتنمان بۆ ئەم بەسەرهاتە، زریانێك لە هەست و خرۆشی تاوسەندووی لەدڵانماندا هەڵایساند.

ئەبرونوور خاتوون بەردەوام بوو:

– ئایسێل لەبەر خۆیەوە دەستی کرد بەدوعا خوێندن:

" دێمە حوزوورت پەروەردگارم! بەم حاڵەوە قبوڵم بفەرموو، ئیمانم هێنا بە گەورەیی و شکۆمەندیت، تۆ بەدیت هێناوم و هەر بۆلای تۆش دەگەڕێمەوە".

ئەوجا چەندجارێك لەسەریەك دووبارەی کردەوە: "با دایکم بێت، با دایکم بێت" منیش پرسیم:" کێ بێت؟".

وەڵامی دایەوە: "لێم دەپرسن دایکت بێت بتبات، یان کەسێکی تر، منیش دایکم ویست، دایکم دێت".

لەپڕێکدا بێ دەنگ بوو. دەتوت هەموو سەرنجی داوەتە ئەو دەنگەی کە دێت. لەوکاتەدا بریسکە و ڕووناکییەك دای لە ڕووخساری و چاوانی ئێمەشی برد. لەناو کاریگەری تابلۆکە من و ئەمینە خاتوون بەحەپەسانەوە چاومان بڕیبووە یەکتری.

خاتوو ئایسێل ئا لەو کاتەدا بەدەنگی بەرز و لەنێو خشوعێکی مەزندا "الله أکبر الله أکبر، لا إله إلا الله"ی وتەوە و بەدوایشیدا شایەتومانی هێنا.
من و ئامینە خاتوون لەبەرامبەر ئەم دیمەنەدا سڕبووبووین. جارێ من لەژێر کاریگەری دۆخەکەدا ئەبڵەق دامابووم.
ئەم زنجیرە ڕووداوە دەتوت بوونەتە مایەی نوێکردنەوەی ئیمانەکەم.
تا کاتژمێر سێ قورئانمان بەسەردا خوێند. خۆشی هەوڵی دەدا ئەوانەی ئێمە دووبارە بکاتەوە.
لەو کاتەدا کە سورەتی "یاسین" م بەسەردا دەخوێند، و خاتوو ئامینەش خەریك بوو دایدەپۆشی، لەو پەنجەرەیەی کە ڕووە و قیبلە بوو ڕووناکییەك وێنەی هەورە بروسکە درەوشایەوە و هەموولایەکی پەنجەرەکەی ڕووناك کردەوە، ئێمە هەردووکمان شاهیدی ئەمەین. ئەو ڕووناکییە تەنانەت زاڵ بوو بەسەر ڕۆشنایی گڵۆپی ژوورەکەشدا.
هەر کە ئایسێل ئەو ڕووناکییە درەوشاوەیەی دیت، هەوڵی دا تا ڕاست بێتەوە و ئەمینەش هاوکاری کردو ڕاستی کردەوە.
زۆر بەتاسەوە قۆڵەکانی والاکرد و هاواری کرد: "دایە، تۆی ها! مەگەر دایەگیان تۆ هاتوویت بمبەیت؟
بەشێوەیەك دەستەکانی کردبووەوە هەروەك ئەوەی دایکی لەئامێز گرتبێت، ئەوجا دەستەکانی بەیەك گەیاند و پاش ماوەیەك سەری نەوی بووە سەر قۆڵی ئەمینە... دواسات کە چاوم بڕییە چاوەکانی، پێڵووەکانی چاوی لە داخستندا بوون. لەچاوانیدا بریسکەیەکی پڕ ئاسودەیی و لەسەر لێوانیشی بزەیەکی شیرین خۆی دەنواند.

ئـەم دوایـین ڕوانینــە، ماڵئاوایـیـەك بـوو لـە گونـاھ و تاڵیـیـە تاقـەت پڕووکێنــەکان و "ســڵاو"ێکیش بـوو لــە کامــەرانی ھەمیشــەیی... کۆتـا ھەناسەیشی "الله أكبر، الله أكبر" بوو.

لە جێگەکەیدا پاڵمان خست، بـەم شێوەیە تەمـەنێکی گـەنجی پـڕ لـە ناخۆشی و نەخۆشی کۆتایی پێهات.

لەوانەیە فریشتەی گیانکێشان لەشـێوەی خۆشەویستترین کەسـیدا کـە دایکی بوو خۆی نیشان دابێت، ئەو ئیمانە پتەو و قووڵەی کـە ھـەیبوو لـەو باوەڕەدام پشتیوان بەخوا بووبێتە مایەی پاك کردنەوەی سەرجەم گوناھ و سەرپێچییەکانی.

بەڕاستی بووینە شاھیدی سیمای ڕاستەقینەی مردنی بەئیمانەوە.

## ئەی ئێمە، ئەی ئێمە چی؟

خاتوو ئەبرونوور لەنێو فرمێسك و ھەنسکدا دوایەمین وتەکانی دەربڕی، بەڵام کۆتا ڕستەی ئەوەندە لەناخەوە و بە دڵ سووتاوییەوە وت کـە ئیـدی ھەمووان دامانە پڕمەی گریان...

ئـەم دوا ڕسـتەیە پێویسـتە ئێمـەو، ئێـوە و ھـەموو مرۆڤایـەتی ڕۆژی سەدجار لەخۆمانی بپرسین.

ئەی دوا ساتی ئێمە چۆن دەبێت؟

لە ژینی پڕ ئەسرینی خاتوو ئایسێڵدا وانەگەلێکی گرنگ ھەن کە لێوەی فێربین. پێویستە ھەموو مرۆڤێکی ژیر ئەو وانانە باش ھەڵسەنگێنێت.

چونکە ھیچ قازانج و سەروەتێك لەبەدەستهێنانی ئیمان و بـە ئیمانــەوە ماڵئاوایی کردن گەورەتر نییە.

بۆیە سبەینێ دەشێ درەنگ بێت...

ڕۆحت شادبێ...

# چەند پەیڤێك لەخوێنەرانەوە



"مامۆستا گیان نازانم چۆن ستاییشتان بکەم، کاتێك کە ئەم نامەیە دەنووسم دەستەکانم دەلەرزێت، من دایکێکی چاو بەفرمێسکی دانیشتووی ڤیەننام، چەند ساڵێکە بەردەوام شەڕ و دەمەقاڵێمە لەگەڵ کچەکەمدا کە گیرۆدەی سەرشێتییەکانی هەرزەکاری بووە. ئەوەندە بێچار مابووم کە لەباسکردن نایە. بەڵام لەکۆتاییدا پەروەردگارم نزاکانی ئەم دایکە چاو تەڕە گوناهبارەی قبووڵ فەرموو و کچەکەم ڕۆمانی "ئایسێڵ"ی بەڕێزتانی دەست کەوتبوو. سوپاسی بێ پایان خوایە گیان، ئێستا نوێژەکانی بە بەردەوامی دەکات، تکا دەکەم ئەم کتێبەتان وەربگێڕن بۆ زمانی ئەڵمانیش تاکو خەڵکانی ئێرەش لێی سوودمەندبن. لەهەموو نوێژەکانمدا دوعاتان بۆ دەکەم".

خوشکتان/ فاتیمە



"مامۆستا خالید، من بازرگانم و له کۆماره تورکەکانـدا ئیش دەکـەم. سـالآنێکه لەکەشـی مەعنـەوی بـەدوورم. کاتێـك کـه چـوومە ئـەو وڵاتانـه کتێبەکانی بەڕێزتانم لەدەسـت گەنجانـدا دەبینـی. هـەمووان بەپێزانینـەوە باسیان لێدەکرد. بەوپێیەی که کچەکەم ناوی "ئایسێڵ"ە سـەرەتا کتێبـی "ئایسێڵ"ی جەنابتانم کڕی. هەرلەناو فڕۆکەدا کـه بـۆ تورکیـا دەهاتمـەوە کتێبەکەم تەواوکرد، ئای خوایه ئەوە چ دنیایەکی جیاواز بوو! ئایا بینراوە پیاوێکی شەست ساڵانه وەك منـداڵ بگـری؟ دەسـت و چـاوتان خۆشـبێت. لەڕاستیدا من کەسێکی باوەڕدار بووم بەڵام "ئایسێڵ" گوڕوتینی دامەبەر.

سوپاس بۆ خوا ئێستا هەموو ڕۆژێك لەدەرگای پەروەردگارم دەدەم.

مامۆســتا گیــان، پێویســته شــاکارەکانت بــۆ هــەموو زمانــەکان وەربگێـڕدرێن، چـونکه ئـەو بابەتانـەی کـه باسـی دەکـەن، پەیوەندیـدارن بەسەرجەم کۆمەڵگەکانی جیهانەوە. تەنانەت پێویسته بکرێت به فیلمیش. لەم بارەیەوە چۆن دەتوانم یارمـەتیتان بـدەم؟ چـاوەڕێی فەرمانـەکانتانم. لەگەڵ ڕێز و حورمەتمدا.

سەدات



"من کوبرا یۆزگاتی، له بەلجیکا دەژیم. تەمەنم ١٩ ساڵە. داو و تەڵە فریودەرەکانی ژیان منیشیان بەرەو لێواری خۆکوشتن ڕاپێچکرد. لەوکاتەدا کە سەرقاڵی دوایەمین ئامادەکارییەکان بووم بۆ کۆتایی پێهێنانی ژیانم، ڕووبەڕووی ڕۆمانی "ئایسێل" بوومەوە، کە خزمێکی دوورمان لەتورکیاوە بۆی ناردبووم. تەماشای کارسازی پەروەردگار بکەن، لەوکاتەدا کە خەریك بوو ژیانم کۆتایی پێ بێت، ئەم کتێبە بووە مایەی ڕزگار کردنم.

دایکان، باوکان، پەروەردەکاران، لێپرسراوان، چی دەبێت ئەم کتێبە بخوێننەوە و ڕێنمایی خەڵکیش بکەن بۆ خوێندنەوەی. دڵنیابن هەزارەها "کوبرا"ی پەرێشان ڕزگار دەکا کە لە ژیاندا بەرەو مەرگ ڕادەکەن..

مننەتدارتانم مامۆستا، دەستان ماچ دەکەم.

کچتان/ کوبرا

## ئایسێل...

خالید ئێرتوغرول، نووسەرێکە ڕۆژانە نامەی لەژمارە بەدەری پێدەگات. ئەم نامانە ڕووداوی سەرسوڕهێن، یاداشتی هەمەچەشن و بەسەرهاتی گەڕانەوە دەگرنە خۆ.

نامەکان چۆنیەتی ڕزگاربوون و بەئیمان شادبوونی ئەو ژیانانە دێنێتە زار کە لە نێو پۆنگاوی بێ سەروبەرەییدا گیریان خواردووە و سازگاری ژینیان بە گوناه و سەرپێچی لێڵ بووە. لەگەڵیشیدا تابلۆی تریفەی دڵان لەئاسوودەییداو بارینە لێزمەی ئەسرینی سۆماکان دەنەخشێنێت.

"ئایسێل"ی بەردەستی خوێنەری ئازیزیش یەکێکە لەو نامانە...

کچێکی لاوی بێکەس و نەوا، لەبەشی پێگەیاندنی بێ سەرپەرشتیاراندا گەورە دەبێ و لەژێر چەپۆکی مرۆڤە بێ ویژدان و بەدنیازەکاندا گەنجێتی پەژموردە دەبێ، کێشمانکێشێکی بەردەوامی ئاوەز وەستێن و لەکۆتاییشدا شێرپەنجەی کوشندە.

لەجەرگەی هەوڵی خۆکوشتندا، هەڵهاتنی خۆری ئیمان و گەڕانەوەیەکی پڕ پەند و کۆتاییەکی ناوازە...

ئەم کتێبەی کە پەردە لەسەر پەیوەندییەکانی مرۆڤ و، پرسەکانی گەنج و نابوودییەکانی کۆمەڵگا هەڵدەماڵێت، سەرگوزەشتەی کچێکە لەدەمی خۆکوژیدا...

# پێڕست

# AYSEL

## HALİT ERTUĞRUL

ڕۆژانە ژمارەیەکی زۆر نامەی جۆراوجۆر دەگاتە نووسەری بەناوبانگ مامۆستا (خالید ئێرتوغرولّ)، زۆر لەو نامانە بریتین لە چیرۆکی گەڕانەوە و بیرەوەری جۆراوجۆر و ڕوداوی سەرسورهێنەر.. ژیانی کەسانێك باس دەکەن کە ئالودەی سەرلێشێواویی و تاوان و لەناوچوون بوونەتەوە و لە کۆتادا ڕزگاریان بووە و بە تیشکی ئیمان شادبوونەتەوە، کانیاوی چاوەکانیان پڕ فرمێسك بووەتەوە و دڵە بچووکەکانیان بوژاوەتەوە.
(ئایسێلّ)یش یەکێکە لەو چیرۆکە ڕاستەقینانەی لە نامەیەکدا بۆ مامۆستا هاتووە، کچێکی گەنج ، بێ کەس و بێ باوك ، لە خانەی بێ باوکان گەورە بووە ، لە تەمەنی گەنجێتیدا بەدەست مرۆڤە بێ ویژدان و نیاز خراپەکان پەرێشان ببوو ، بۆیە لەژێر قورسایی ئەو گرفتانەدا و لەنێو هەواڵی توشبوونی بە نەخۆشی شێرپەنجە بیر و عەقڵی دەکوژێتەوە و بڕیار دەدات خۆی بکوژێت.. لەو ساتە پڕ ئازارانەدا تیشکێکی بەهێز لە نێو پەڕەکانی دڵیەوە هۆش و عەقڵی دەدرەوشێنێتەوە و ناخی ڕۆشن دەکاتەوە!
کۆتاییەکی سەرسورهێنەر و ئەنجامێکی بەپیت.
ئەم کتێبە چیرۆکی کچە لاوێکی بێ نەوایە ، پرسیارگەلێکی هەیە دەربارەی پەیوەندیەکانی مرۆڤ و کێشەکانی گەنجێتی و خراپبونی کۆمەڵگا.




ISBN 0-0004-0000-9



9 780000 400000

نرخی (٣٠٠٠) دینارە

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA Media Center
ara.m@hotmail.com


